ئارام سدیق

# دۆزی ژن و هەزارەی نوێ

## چەند بابەتێك لەمەڕ دۆزی ژنی کورد

سلێمانی ٢٠٠٧




- ناوی کتێب: دۆزی ژن و هەزارەی نوێ
- ناوی نووسەر: ئارام سدیق
- بابەت: وتار و لێکۆڵینەوە
- تایپ: ئاشتی و ئاشنا صدیق
- بەرگ: نووسەر
- تیراژ: (٥٠٠) دانە
- چاپ: چاپی یەکەم- ٢٠٠٥
- چاپی دووەم ٢٠٠٧
- ژمارەی سپاردنی (٦٤٨)ساڵی ٢٠٠٥

# لەبری پێشەکی

قسەکردن لەسەر کێشە جۆراوجۆرەکانی ئەمڕۆی ژنانی کورد کارێکی سانا نییە، چونکە ئەگەر بەوردی لەسەرجەم رەهەندە سۆسیۆلۆژی و سایکۆلۆژیەکانەوە بڕوانین ئالۆزییەکی زۆر بەدی دەکەین و ئەم ئالۆزیەش رێگریی گەورەی ئەو قسەکردنەیە، چونکە ناتوانرێ توێژینەوەیەکی راستگۆیانە ئەنجام بدرێت تا خاوەنی کۆمەلگەیەکی هێندە داخراو بین و ناتوانین دەست بۆ تابۆکانی نێو ژیانی ژنان بەرین و لێیان بکۆڵینەوە و هەوڵی رێگەچارە و بنبڕکردن و کەمکردنەوەیان بدەین.

ئەمڕۆ لەکوردستان و دەرەوەی کوردستانیش وتار و لێکۆڵینەوەی زۆر دەبینرێ لەمەڕ کێشە هەنووکەییەکانی ژنانی کورد، بەڵام زۆرێك لەم وتار و لێکۆڵینەوانە، یان سنوورێکی زۆر تەسکیان لە خۆگرتووە یان نەیانتوانیوە راشکاوانە لەسەر دیاردەکان بدوێن و پەنجە بۆ تابۆکانی کۆمەلگە رابکێشن و لەو دیو پەردەوە و بە شێوەیەکی



تەمومژاوی لە دیاردە جۆراوجۆرەکان دواون، بۆیە پێموایە ئەمڕۆ کاتی ئەوە نییە لەو دیو دەرگاکانەوە لەسەر کێشە هەنووکەییەکانی مرۆڤ بەگشتی و ژنان بەتایبەتی قسەبکرێت.

ئەم کتێبە لە چوار بەش پێکهاتووە و ئەگەرچی بەشەکانیش تا رادەیەکی کەم لەیەکەوە دوورن، بەڵام هەموویان لەو خاڵەدا یەکدەگرنەوە کە دەیانەوێت قسەیەك لەسەر (دۆزی ژنیکورد) بکەن لە ئەمڕۆدا و کردنەوەی پەنجەرەیەکی نوێ بن بۆ قسەکردن لەسەر ئەو دیاردانەی بوونەتە مشەخۆری گیانی کۆمەلگەی کوردی و رێگری بەردەوامی بەردەم بەرەو دیموکراسیەت و مەدەنیبوون و یەکسانی نێوان هەردوو رەگەزن. لێرەوە دەمەوێ ئەوەش بڵێم کۆی ئەم وتار و لێکۆڵینەوە و دیدارانە لە ساڵی (٢٠٠٤-٢٠٠٥)دا هاتوونەتە بوون و کارکردن و ماندووبوونی قۆناغێکی دیاری کراوی منە، بۆیە کۆکردنەوەیانم لەم کتێبەدا بە پێویستزانی.

ئارام سدیق

٢٠٠٥/٧/٢١

# بەشی یەکەم

# دۆزی ژن و هەزارەی نوێ

ئەوەی لەم بەشەدایە شەش چاوپێکەوتنە لەگەڵ شەش خانمی چالاکی بواری دۆزی ژنی کورد و ساڵی (٢٠٠٤) لە ژێر ناونیشانی (دۆزی ژن و هەزارەی نوێ) بڵاوکراوەتەوە.

# دیداری مهاباد قەرەداغی



★دۆزی ژنان لە جیهاندا چۆن دەبینیت بە گشتی و دۆزی ژنانی کورد لە چ ئاستێکدایە ؟

- دیارە وەکو ئەوەی ئەم سەدەیە ناونراوە بەسەدەی مافی ئافرەت، لەو ڕووە وە لەهەندێ شوێنی جیهاندا ئەم قسەیە ڕاستە و کاریگەری هەیە، ژنان لەوێ توانیویانە لەبەندەکانی دەسەلات بگەن و توندوتیژی لەناو کۆمەلگەدا تاڕادەیەکی باش کەم بۆتەوە. توندوتیژی دیاردەیەکە لەهەموو کۆمەلگەیەکدا هەیە، هیچ کۆمەلگەیەك نیە لەدنیادا و ناتوانین بلێین لەداهاتوشدا دەبێت کە توندوتیژی تێدا نەبێت، بەلام ڕێژەی توندوتیژی لەکۆمەلگەیەکەوە بۆ کۆمەلگەیەکی تر دەگۆڕێت. کۆمەلگەی وایە توانیویەتی تاڕادەیەك دیموکراسی پەیڕەوبکەن و زۆر ریفۆرمی کۆمەلایەتی و سیاسی بکەن و ژنان بەزۆر لەپلەو پایەی کۆمەلگە بکەن توندوتیژی تاڕادەیەکی زۆر کەم بۆتەوە.

دیارە توندوتیژی تەنها تایبەت نیە بە ژنان، بەلکو ئەگەر لەکۆمەلگەیەك توندوتیژی هەبێ ئەو دژ بە پیاوان و مندالانیش هەیە، بۆیە پێموایە لە ئەوروپاو ئەمریکادا خەباتی فیمینیستی توانیویەتی هەنگاو بەرەو پێشەوە

بنێ و ئەزموونێکی دروست کردووە بتوانرێ لەوڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا سود لەو ئەزموونە ببینرێ، بەڵام سوود وەرگرتنێك نەك تەنها بەگواستنەوەی، بەڵکو بەکارکردن و گونجاندنی بەگوێرەی تایبەتمەندیەکانی ئەو کۆمەڵگەیە.

سەبارەت بەتوندوتیژی لەکۆمەڵگەی کوردیدا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەگشتی، توندوتیژی دژی ژن دەگاتە لوتکەی خۆی و، لەدوای ڕاپەڕین کە بارێکی واڕەخساوە کە زۆر گروپ و ڕێکخراو دروست بوون کە پشتگیری لەمافەکانی ژنان بکەن و ریفۆرمی ئابوری و سیاسی و کۆمەڵایەتی بکەن، بەڵام خەباتێکە لەسەرەتایدایە.

توندوتیژی لەو کۆمەڵگانەی کەتێڕوانینێکی ئاینی بەسەردا زاڵە کەیاساکان لەسەر ڕێساو داب ونەریتی کۆنەپەرستانە دادەڕێژرێن و کلتورێکی باوکسالارانە بەسەر کۆمەڵگەدا زاڵە، ئەوانەی داڕێژەری پەیڕەوپڕۆگرامی حزبەکانن لەعەقڵێکی باوکساری و کۆنخوازیەوە ئەو بەرنامانەیان داڕشتووە، ئەمانەش هۆکارن کەتوندوتیژی لەکۆمەڵگەی ئێمەدا بگاتە چڵەپۆپە و پیاو وەك باڵاو ژن وەکو کاڵاو بن دەستە.



*بەرای بەڕێزت ڕێکخراوەکانی ژنان توانیویانە بەدیهێنەری مافەکانی ژنان بن، ئایا تا چەند لەم ئەرکەدا سەرکەوتوو بوون؟

-لەڕاستیدا زۆر ئاساییە هەر حزبێك ڕێکخراوی ژنانی هەبێ و لە هەموو دنیاشدا هەیە، بۆ نموونە حزبی سۆسیال دیموکراتی سویدی ڕێکخراوی ژنانیش هەیە، بەڵام لەوێدا ژنان هێندە پابەندنین بەو شتانەی پیاوان دایانناوە. سیاسەتی تایبەتی خۆیان هەیە کەژنان خۆیان داڕێژەرین، لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەگشتی ئەو حزبانەی ڕێکخراوی ژنانیان هەیە، ئەو ڕێکخراوانە پابەندبن بە سیاسەتی حزبەکانیانەوە کە پیاو داڕێژەرین. تا ئەم ساتەش کە من قسەی تێدا دەکەم سەرکردایەتی حزبەکان خاڵین لەژن و هەموو پەیڕەو پڕۆگرامەکانی حزب پیاو دایڕێژراوە، ئەگەر خاڵێك لە خاڵەکانی پەیڕەوی ناوخۆی حزبەکان ئەوەی تێدابێ کەتێدەکۆشێ بۆ مافەکانی ژن و داکۆکی لەمافەکانی دەکات تەنها وەکو بانگەشەو تەنها وەکو تیۆری ماوەتەوەو لەپراکتیکدا ئەوە نابینین، بۆ نمونە لە سەرکردایەتی حزبەکاندا دەنگی ژنی تێدانیە ئەو شۆڕشانەی لەمێژووی کورددا هەبوو هەمیشە دەنگ و ڕەنگ و کارای هی پیاو بووە و ژن فەرامۆش و

پەراوێزخراوە لەناو یاساو رێساکاندا هەموو ئەو شتانەی پیاو دارڕێژەری بوون ژنیان لە پەراوێزدا داناوە.

ئەو رێکخراوانەی پەیڕەوی رێنماییەکانی حزبەکەی خۆی دەکات بێگومان سنوردار دەبێو ناتوانێ رای لەسەر مەسەلەی ژن هەبێ. من لەسەرەتای ئەم ساڵەوە (٢٠٠٤) هەست دەکەم هەستێك هەیە کە رێکخراوەکانی ژنان ئازادی ئەوەیان هەبێ وەکو ژن(نەك دابڕاو لە حزبەکان) خۆیان دارڕێژەری هەندێ بەرنامەبن کە بتوانن گەشەی پێبدەن. هەروەها دەبینم لەبڵاوکراوەکانی ژناندا زۆربە جورئەتەوە قسە لەسەر کوشتنی شەرەف و شتی تر هەیە، کە ئەمە ئاسۆیەکی روونە، هەڵبەت لە کۆمەڵگەکانی دراوسێکاندا ئەم دیاردانە هەیە بەڵام کەمتر قسەی لەسەر کراوە. ژنی کورد لەو رووەوە توانیویێتی جەریئانە قسەی خۆی بکات، کە ئەمە من بەخاڵێکی پۆزەتیڤانەی لەقەڵەم دەدەم.

*پێتوایە لەنێو رێکخراوەکانی ژناندا ئەو رێکخراوانە چالاکن کەسەربەحزبن، یان رێکخراوە ناحزبیەکان؟

- بێگومان تۆکە سنورێکت بۆ دیاری نەکرێت ئازادتر دەتوانی بەرنامە بۆ خۆت دابڕێژی و کاری لەسەر بکەیت، وەکو سروشتی کارکردن رێکخراوە ناحزبیەکان توانیویانە



کاری باشتربکەن، ئەوان ئەو ئیمکانیەتەیان لەبەردەستدانیە، بەڵام رێکخراوەکانی سەربەحزب ئیمکانیەتی باشتریان لەبەردەستە لەرووی ئابووریەوە و وەکو وتم پابەند دەبن بە بەرنامەی حزبەکانیانەوە ئازادنین لەدارڕشتنی بەرنامە، بەڵام ئەو رێکخراوانەی لە دەرەوەی حزبن زۆربەی کات کێشەی ئابوریان دەبێت و ئیمکانی ئەوەیان نیە بۆ بەرەو پێشبردنی پڕۆژەکانیان، زۆرجار پڕۆژەکانیان دوا دەکەوێت و لە تیۆریدا دەمێنێتەوە و ناتوانن پڕاکتیزەی بکەن.

*کەسێتی کوردی کەسێتیەکی نەگۆڕاوە، بەتایبەتی پیاو، کە پاش ئەم هەموو پێشکەوتنەی جیهان هێشتا بە تۆمەتی شەرەف و شتی تر ژنان تیرۆر دەکرێن ، ئەمەش تەنها لە کوردستان نیە ، بەڵکو لە ئەورووپاش روویدا وەکو تیرۆر کردنی (فاتیمە) و چەندانی تر ، پێتوایە هۆی نەگۆڕانی عەقڵی پیاوی کورد چیە؟ لەکاتێکدا ژینگە و کۆمەڵگاش گۆڕدراوە ؟

-لەڕاستیدا باوکانی وەکو باوکی(فادیمە) کە ساڵانێکی زۆریش لە ئەوروپا دەبن، هەلگری هەمان کلتورن کە لە کوردستان هەیە، ئەوە من بەشتێکی ئاسایی دەبینم، باوکی فادیمە نەخوێندەوارە و پەنجاساڵ لەئەوروپابێت ناتوانێ

فێری شتێك بێت، ئەوە كێشەیەكی بەردەوامە، من لەسوید كە وەكو وەرگێڕیش كارم كردووە زۆر كەس دەدوانزە ساڵە لەو وڵاتەیە نەیتوانیوە زمانی ئەو وڵاتە فێربێت، كەواتە كە زمانی ئەو وڵاتە فێر نەبێت ناتوانی لەكلتوری ئەو وڵاتەش سودمەند بێت و گۆڕانكاری لەفیكری خۆیدا بكات و لە شتە باشەكانی كلتوری بەرامبەر سود وەربگریت، بۆیە كارلەسەر كلتوری خۆت دەكەی، لەوێدا كەسانی وەكو باوكی فادیمە زیاتر پابەند دەبن بەكلتوری خۆیانەوە بەوەی كە ئازادیەك دەبینن بەتایبەت لەمەسەلەی ژندا ئەوان ناتوانن لەو ئازادیە تێبگەن، بۆنمونە لەوێدا لەنێوان كوڕو كچدا ئەڵتەرناتیڤێكی تری زەواج هەیە بەوەی بەتەنها زەواج ئەوەنیە ژن و پیاو مارە ببڕدرێن و ئەوساببنە(ژن و مێرد). لەوێ سێ جۆر ئەڵتەرناتیڤی زەواج هەیە، یەكێكیان كچ و كوڕ پێكەوە دەژین بەبێ مارەبڕین، دووەم ئەوەیە كچ و كوڕ پەیوەندیان هەیە، بەڵام لەدووشوێنی جیاوازدا دەژین، جۆری سێیەم ئەوەیە جاروبار پێكەوە دەژین و جاروبار جیا دەژین. ئەمانە هەموو ئەلتەرناتیڤی جیان لەكلتوری كەسێكی نارۆژئاوای، ئەو ئەگەر زمان فێرنەبێت ناتوانێ لەو ئازادیە تێبگات، بۆیە دەكەوێتە دژایەتی كردن لەگەڵ خۆیداو زیاتر



پابەند دەبێ بەكلتورەكەی خۆیەوە پێیوایە ئەو ڕەسەنایەتیەی لەكلتوری ئەودایە دەبێ بپارێزرێ و ئەو سنورداركردنی ژن بە ڕەسەنایەتی دادەنێت، دیارە ئەوە لای ئەو ڕەسەنە، نەك لەڕاستیدا، بەڵام كەسانێكی زۆریش هەن سود لەو كلتورانە دەبینن و شتە باشەكانی بۆ خۆیان دەگوێزنەوە و زۆرجار دەیگوێزنەوە ناو وڵات لەڕێی نوسین و ئاڵوگۆڕی بیروڕاوە.

★پێتوایە تەكنەلۆژیا تا چەند خزمەتی بە دۆزی ژنان كردووە، لە كاتێكدا لەڕێی كەناڵ و سایتە سێكسیەكانەوە قێزەونترین دیمەنی ژنان بڵاودەكرێتەوە ؟

-هەموو ئەو پێشكەوتنە خێرایانەی روو دەدات ئەگەر دەرفەتێكت نەبێت بۆ سودوەرگرتن لێی، لایەنە پۆزەتیڤەكانی پێشكەوتنی تەكنەلۆژیاو گەردوونگەرایی بەگشتی بەسەردا زاڵ دەبێت، ژن لەكۆمەڵگەكانی جیهاندا دەرفەتی ئەوەی بۆ نەرەخساوە لە پرۆژەی گەردوونگەرایی سودمەندبێت، بۆیە زیاتر بەرزیانەكانی دەكەوێت، كاتێك جەستەی ژن دەكرێتە كاڵا بۆ ساخكردنەوەی كاڵای بازرگانی. بۆنمونە كە ریكلام بۆ كۆمپیوتەرێك دەكرێت ژنێكی رووت دادەنرێت و هەروەها بۆ قەڵەمێكیش

بەهەمان شێوە، واتە توانراوە لەڕێی وروژندنی غەریزەی سێکسیەوە کاڵاکان ساخبکرێتەوە.

هەروەها ئەو کەناڵە سێکسیانەی کەتۆباسی دەکەی، لەوێدا زیاتر بازرگانی بەجەستە ژنەوە دەکرێت، لێرەدا کەباسی ئازادی دەکرێت و دەڵێین با جەستەی ژن ئازاد بێت، بەومانایەی کەجەستەی دیوی دەرەوەی مرۆڤە، کەئەو ئۆرگانە زیندوانەیە کە مرۆڤ دەهێڵێتەوە و کەسایەتی تۆ بە بەرامبەر دەناسێنێ، ئەو جەستەیە پێویستە لەو رووە وە کارابێت و پەرە بەکەسایەتی تۆبدات، نەك ببێتە کاڵایەکی بازرگانی لەکۆمەڵگەی مۆدێرندا ژن بەوشێوەیە جەستەی بەکاردەهێنرێت وەکو لەفیلمی سێکسی و ریکلامەکاندا، لەکۆمەڵگە تەقلیدیەکانیشدا جەستەی ژن کراوەبە سندوقێك بۆشەرەفی پیاو و رەوایەتی دەدرێ بەدادڕینی ئەو جەستەیە و بەکوشتنی، یان وای لێدەکرێ خۆی بسوتێنێ، چونکە ئەو جەستەی کراوەبە سندوقی شەرەفی نێرینەی بنەماڵەو خێزانەکەی. لەهەردوو کۆمەڵگەدا لەمۆدێرن و تەقلیدیشدا لەو بەشەدا کەجەستەی ژن کاڵایەکە بۆ کۆمپانیایەکە ولای ژن و پیاو لە سروشتی مرۆڤانەی خۆیان دوور دەخرێنەوە.



★ پێتوایە خۆسوتاندن دەرئەنجامی چیە؟ چی وا لە ژنان دەکات بیر لەم رێگایە بکەنەوە، پێتوایە ئەمە چارەسەرە یان ئەو پەڕی بێتوانایی ؟

-لەرووی دەرونیەوە من لێکدانەوەم بۆی هەیە، کاتێك ژن دەرك بەوەدەکات، کە ئەوە جەستەی ئەوە بۆتە کاڵایەك بۆ نێرینەکانی بنەماڵەکەی هەست بەکەم و کوڕی کۆمەڵایەتی دەکات و دەیگەیەنێتە حاڵەتی خەمۆکی ئەو کاتە بێزار دەبێ لە جەستەی خۆی و کاتێکیش دەگاتە ئەو پەڕی خەمۆکی سزای خۆی و کۆمەڵگەکەی بەوە دەدات ئاگر لەجەستەی بەربدات، بۆیە من خۆسوتاندنی ژنان بەسزایەك دەبینم بۆ خۆی کۆمەڵگەکەی و بەو ئاگرە ئاماژەی پێدەدات، چونکە ئەو جەستەی خۆی تەنها بەسندوقێکی بەتاڵ هیچی تری تێدا نابینێتەوە ئەو سندوقەش شتێکە شەرەفی کەسانی تری تێدا دانراوە هیچ بایەخێکی بۆ خۆی نیە بۆیە سزای خۆی بەوە دەدات کە سزای کۆمەڵگەکەی و نێرینەکانی بدات و میکانزمێکی بەرگریشە ژن بەکاری دەهێنێت.

★دواهەمین کتێب لەمەڕدۆزی ژن کتێبی(شەرەفنامە)یە، ئەو میتۆدانە چین پشتت پێ بەستون بۆ نوسینی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەمەڕ دۆزی ژنان؟

- دیاره من زیاتر سود لەدەروونناسی کۆمەڵایەتی سودی لێ دەبینم بۆ ئەولێکۆڵینەوانە، پێموایە هەموو دیاردەکانی نێو کۆمەڵگە پێناسە بکرێن، بەتایبەت لەم کتێبەدا هەوڵم داوە چەمکی(شەرەف) پێناسەبکرێت، بەوشێوەیەی دەمەوێ بڵێم جەستەی ژن شەرەفی پیاو نیە ئەو سندوقە نیە کە بۆ پاراستنی شەرەفی پیاو بەکار بهێنرێت، بەڵکو ئەو ئۆرگانەیە کەپێویستە بەکاری بهێنێت بۆ گەشەپێدانی کەسایەتی خۆی. ئامانجی سەرەکی ئەم کتێبە ئەوەیە کە دیاردەکانی نێو کۆمەڵگە پێناسە بکرێت، دەمەوێ ئەوە پێناسە بکەمەوە کەبەئەدەببوون چیە؟ ئازادی چیە؟ هەروەها ئەو چەمکانەی لەکۆمەڵگەی کوردیدا پێناسەی هەڵەیان هەیە هەوڵێکم داوە بۆ دووبارە پێناسەکردنەوەیان بەتایبەت جەستەی ژن و شەرەف.

*تەمووزی ٢٠٠٤*

# دیداری بێخاڵ ئەبوبەکر



★دۆزی ژنـان لـە جیهانـدا چـۆن دەبینیـت بـە گـشتی و دۆزی ژنانی کورد لە چ ئاستێکدایە ؟

-دیارە، مەسەلەی ئـافرەت و سـەرهەڵدانی بزوتنەوەکـەی و بەرەوپێش چوونی دۆزەکـەی بـەپێی شـوێنی جـوگرافی و هۆکاری مێژوویی، لەشـوێنێکەوە بـۆ شـوێنێکیتر، جیـاوازی هەیە.

بەواتایـەکیتر، فاکتـەرەکانی سـەرهەڵدانی بزوتنـەوەی ژنـان لـەنێوان کۆمەڵگـەی رۆژهـەڵات و رۆژئـاوا جیـاوازی هەیـە و نـاکرێ بەیـەك پێـودانگ بپێـورێن و هـەمان رێگاچارەش بۆ گرفت و کێشە جیاوازەکان، پیادەبکرێت.

لەگـەڵ ئـەم جیاوازیانەشـدا، دەتـوانین بڵـێین بەرئەنجامەکان هاوشێوەن، ئـەویش بریتییـە لەپەکخستنی رۆڵـی کاریگەرانـەی ئـافرەت بـۆ بەشـداری راسـتەقینە لـەبوارەکانی ژیانـداو بێبەشـکردنی کۆمەڵگەیـە لـە نیـوەی وزەو تواناکـانی و کاریگـەری راستەوخۆشـی هەیـە لەسـەر بەرەوپێشچوونی لەڕووی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری وئـابوری و سیاسی و هەروەها لەسەر داهاتووی نەوەی نوێوە.

لەم سەردەمەدا ، هۆشیاریەکی بەتینتر لە جاران لەسـەر ئاستی جیهان ، سەبارەت بە گرنگی رۆڵـی ژنـان هەست پـێ

دەکرێت . لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمەوە، چەندین کۆنگرەی نێودەوڵەتی تایبەت بە ئافرەت گرێدراوە و چەندین بڕیار و ڕێکەوتننامەشیان لێ کەوتۆتەوە، وەك:-

-یەکەمین کۆنگرەی جیهانی ئافرەت لە مەکسیك ساڵی(١٩٧٥).

-دووەمین کۆنگرەی جیهانی ئافرەت لە کۆبنهاگن ساڵی (١٩٨٠)

-سێیەمن کۆنگرەی جیهانی ئافرەت لە نایروبی ساڵی (١٩٨٥)

-چوارەمین کۆنگرەی جیهانی ئافرەت لە پەکین ساڵی (١٩٩٥)

-پەکین +٥ساڵی (٢٠٠٠)

-بڕیاریشە ساڵی (٢٠٠٥)کۆنگرەی پەکین +١٠بۆبەدواداچونی بڕیارەکانی پێشوو ببەسترێت.

سەبارەت بەکوردستانیش، دۆزی ئافرەتی کورد بەچەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە، لەقۆناغی ژێر چەکمەی دیکتاتۆریەتی بەعسدا، خەباتی ژنی کورد مۆرکێکی سیاسی و نەتەوەیی زاڵ بووە بەسەریدا، چونکە لەو کاتەدا میللەت بە هەموو چین و توێژەکانیەوە رووبەڕووی هەڕەشە و پاکتاو کردن دەبویەوە.



لەپاش ڕاپەڕینەوە، سوپاس بۆ خوا، هۆشیارییەکی باش لە رووی کاری ڕێکخراوەییەوە، لەلایەن توێژی ژنانەوە، درك پێ دەکرێت و ژمارەیەکی بەرچاو لە ژنان، خۆیان لەریزی ڕێکخراوەکانیاندا ڕێکخستووە و خەمی گەورە و بەرپرسیارێتی گرنگیان هەڵگرتووە وەك بڕەودان بە توێژەکەیان و خزمەت کردن بەسەرجەم کۆمەڵگە و بەشداری کردنی بوارە جۆربەجۆرەکانی ژیانی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری.

هەرچەندە ئەم بزاوت و بەشداریە، لەئاست هیواو ئاواتی ڕێکخراوەکاندا نییەو هەمیشە بەرەو بەدەست هێنانی دەستکەوتی باشتر و خزمەتی بەرفراوانتر و هێنانە پێشەوەی ژمارەیەکی زۆرتر لە ژنان وهۆشیارکردنەوەی زیاتری توێژی ژنان، هەنگاو هەڵدەگرن.

لەبەر ئەوەی ئافرەتی کورد، لەناو تاڵی و ناسۆریەکانی ژیاندا قاڵبووە قوربانیداوەو پشکی گەورەی مەرگەسات و نەهامەتیەکانیشی بەرکەوتووە، تێگەیشتن و دەرككردنی بە هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی و هەوڵ و کۆششەکانی بۆ هێنانەدی ژیانێکی باشتر، بە بەراورد لەگەڵ

هاوڕەگەزەكانی لەشوێنانی دیكە، بەڕای من، لەئاستێكی بالآتردایە.

جگەلەستەم و نەهامەتیەكان كەلەرووی نەتەوەییەوە دووچاری بۆتەوەو ئێستاكەش ئاسەواری قورس و برینی قوڵ و بەسوێی لەدەرونیدا جێهێشتووە وەك مەرگە ساتەكانی ئەنفال و كیمیاباران و راگواستن و.. هتد، جارێكی تریش لەڕووی كۆمەڵایەتیەوە رووبەڕووی چەندین كێشەو ستەم و چەوساندنەوە دەبێتەوە، ئیتر بەهۆی كەم هۆشیاری و رۆشنبیری كۆمەڵ و دەوروبەرەوە بێت یان بەهۆی تێكەڵ كردنی هەندێك داب و نەریتی نارەوابێت بە یاساكانی شەریعەتی ئیسلامی پیرۆز وەك(كچ خوێندادان، كوشتن بەتۆمەتی شەرەف، مارە بەجاش، تالون و بەزۆربەشودان.. هتد)..

بەرای من، دۆزی ئافرەتی كورد لەبەرەو پێشچوندایەو بەهۆی شۆڕشی زانیاریەكان و چونەدەرەوەی ئەندامانی رێكخراوەكان و بەشداری كردنیان لەكۆنگرە هەرێمایەتی و نێودەوڵەتیەكاندا، زۆر باشتر لە جاران، دەتوانرێت زانیاری و هۆشیاری گەشە پێبدرێت سەبارەت بەمەسەلەی ئافرەت و مەسەلەكانی دیكە و سود لەئەزمونی شوێنانیتر



وەربگیرێت بەڵام بەمەرجێ رەچاوكردن و پاراستنی تایبەتمەندی واقیعی كۆمەڵگەی خۆمان.

*پێتوایە لە كوردستاندا بزاوتێكی داكۆكیكەری تەواو لە مافەكانی ژنان هەبێت، یان سەرجەمیان لە ژێر چاودێری حزبەكاندان ؟

-بێگومان لە كوردستاندا، سەرجەم رێكخراوەكانی ژنان و ژنان و خوشكان و خانمان، دروشمی خزمەتكردن بە توێژەكەیان و داكۆكیكردن لە مافەكانیان بەرزكردۆتەوە و لەڕێی راگەیاندن و بەشەكانی دیكەشیانەوە لەهەوڵی جێبەجێكردنی ئەو دروشمانەوە و كاریشی بۆ دەكەن و جێگا دەستیشیان دیارە، بەڵام وەك لە پرسیارەكەدا هاتووە (ئایا سەرجەمیان لەژێر چاودێری حزبەكاندان؟) دەتوانین بڵێین هەندێك رێكخراو تەنها بۆ بەرز كردنەوەی لافیتەیەكی تایبەت بە رێكخراوێكی ژنان و كۆكردنەوەی دەنگی ژنان لەكاتی پرۆسەكانی هەڵبژاردندا هاتونەتە بوون،یان بۆ ئەوەی حزبێك روی شارستانی بوون و پێشكەوتنی خۆی بە بوونی رێكخراوێكی ژنان برازێنێتەوە، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا پێویستە ئاماژە بەچەند راستیەك بدەین، لەوانەش: فرە لایەنی و فرە رێكخراوەیی دیاردەیەكی گەشی ئاسۆی گەیشتنە

بەکۆمەڵگەی مەدەنی و بەرەنجامی ئەو هەموو سەرکوت کارییەی کاتی رژێمی بەعس بوو کەدەبوایە هەموو دەنگ و رەنگەکان لە (حزب القائد) داو هی ژنانیش تەنها لای (منالّ یونس) کۆببوایەتەوە.

جگە لەمانەش هەلومەرجی سیاسی و ئابووری و تایبەتی پاش راپەرین لەکوردستاندا و هەندێ هۆکاری تری وەك شەڕی ناوخۆو دابەشبوونی دووئیدارە و پشتگیری نەکردنی رێکخراوەکان بەبودجەیەکی تایبەت لەلایەن حکومەتەوە وەك رێکخراوێکی حکومی و لەلایەکی تریشەوە وەك رێکخراوێکی ناحکومی ئەژمار ناکرێت تا فەند لە رێکخراوە بیانیەکانەوە وەربگرن، هەموو ئەمانە وایکرد کەهەر رێکخراوێك لەپاڵ حزبێکدا خۆی ببینێتەوە.

لەگەڵ ئەم راستیانەشدا، هاوشێوە بوونی ئایدیا و رێی خەباتی حزبێك لەگەڵ رێکخراوێکی ژنان یان خوێندکاران یان هەر رێکخراوێکی دیکە، بەدیاردەیەکی نادروست نازانم بەمەرجێك ئەو رێکخراوەیە خاوەنی هەڵوێست و ستراتیژ و بڕیاری تایبەت بەخۆی بێت و حزب و لایەنەکەی بۆ هێنانەدی ئامانجەکانی و خزمەتکردن بەو توێژەی



کەگرنگی پێدەدات، بەکاربهێنێت، نەك بەتەنها خۆی بێتە ئامرازێکی حزبی.

پێموایە لە ولاتە پێشکەوتووە کانیشدا کەسایەتی و رێکخراوەکانی ژنان پەیوەندیان لەگەڵ پارتە سیاسیەکان هەیە و لە ولاتێکی وەك بەریتانیادا، ژنانی ناو پارتە سیاسیەکان دەتوانن بۆ پۆستە سیاسیەکان خۆیان کاندید بکەن.

کەواتە دەتوانین بڵێین، پەیوەندی نێوان حزب و رێکخراو خۆی لە خۆیدا کێشەنییە، بەڵکو کێشەکە لەچۆنیەتی بەکارهێنانی ئەو پەیوەندیەدایە، ئایا پەیوەندی هاوکاری و راوێژکاری وسودوەرگرتنە لەبیرو بۆچونە ئایدیاکان؟

یان پەیوەندییەکی تاکڕەوانەیە و تەنها بۆ وەرگرتنی(ئەمرو نەهی)یە؟!!

٭بەرای بەڕێزت رێکخراوەکانی ژنان توانیویانە بەدیهێنەری مافەکانی ژنان بن، ئایا تا چەند لەم ئەرکەدا سەرکەوتوو بوون؟

-لەپاش راپەڕینە مەزنەکەی بەهاری (١٩٩١)، خەباتی نهێنی و سیاسی رێکخراوەکان وەرچەرخانێکی مێژوویی

گرنگی بەخۆوە بینی و بەرەو کاری ئاشکرای ڕێکخراوەیی، هەنگاوی هەڵگرت.

لەو کاتەوە هەتا ئێستا لە خەبات و کۆششی خۆیان بۆ هێنانەدی مافەکانی توێژەکەیان بەردەوامن.

دیارە بەرەو پێش چوونی ڕێکخراوەکان و هەوڵدانیان بۆ دەستەبەرکردنی سەرجەم مافەکانی توێژەکەیان لە ئاست هیواو ئاواتی خۆیاندا نییە، بەڵام بەپێی توانا و تایبەتمەندی هەلومەرجی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری کوردستان هەوڵیان بۆ داوە.

لێردا پێویستە ئاماژە بەراستیەك بکەین، ئەویش ئەوەیە: کە هێنانەدی مافەکان تەنها لە ئەستۆی ڕێکخراوەکاندا نییە، بەڵکو ئەمانە وەك گروپێکی هۆشیار، دەست نیشانی کێشە و گرفتەکان دەکەن و کۆمەڵگەی پێ هۆشیار دەکەنەوە و پێویستە ببنە هێزی فشار بۆ دەستەبەر کردن و هێنانە دی مافەکان، لەگەڵ ئەمانەشدا پێویستە چەندین لایەنی تر لەم ڕووەوە هاوکاریان بێت:وەك حکومەت و دەزگاکانی، حزب و لایەنە سیاسیەکان، کۆمەڵگە بە گشتی و(پیاوان) بەتایبەتی، جگە لەمانەش ڕۆڵی هونەر و میدیا و ڕاگەیاندن نابێت فەرامۆش بکرێت، چونکە پرۆسەی ریفۆرم و گۆڕانکاری،



فرەڕەهەندە و بەتەنها یەك لا ناکرێت، وەك شاعیرێکی عەرەب دەڵێت:

*متى يبلغ البنيان تحامهُ*

*اژا أنت تبني وغيرك يهدمُ*

بۆ نمونە: هەموو ڕێکخراوەکانی ژنان باس لە پێویستی بەشداری سیاسی ژنان دەکەن و تواناکانی دەخەنە ڕوو و گرنگی ئەو بەشداریە ڕوون دەکەنەوە، کەچی لە بڕگەیەکی درامای تەلەفزیۆنیدا ڕۆڵی ژن بە گاڵتەجاڕی و بۆ پێکەنین دەخرێتە ڕوو و لەسەر زمانی ئەکتەرێکی ژن، ئاماژە بەوە دەدات کە(دەتوانێت لەیەك سەعاتدا (ئەوەندە) بنێشت بخوات و دوو عەشیرەت بەشەڕ بدات)، یان بەداخەوە بەلاسایی کردنەوەی کەناڵە بیانی و عەرەبیەکان، لەکەناڵە ئاسمانیە کوردیەکانیشدا(ئافرەت) کراوەتە ڕەواجی کلیپەکان و ڕۆڵی ئەو تەنها دیکۆرە و بایەخێکی ئەوتۆ بە توانا فیکری و عەقڵیەکان نادرێت.

★کەسێتی کوردی کەسێتیەکی نەگۆڕاوە، بەتایبەتی پیاو، کە پاش ئەم هەموو پێشکەوتنەی جیهان هێشتا بە تۆمەتی شەرەف و شتی تر ژنان تیرۆر دەکرێن ، ئەمەش تەنها لە کوردستان نیە ، بەڵکو لە ئەوروپاش ڕوویدا وەکو تیرۆر کردنی (فاتیمە) و چەندانی تر ، پێتوایە هۆی

نەگۆڕانی عەقڵی پیاوی کورد چیە؟ لەکاتێکدا ژینگە و کۆمەڵگاش گۆڕدراوە ؟

-ئاشکرایە کە(پرۆسەی گۆڕان)، پرۆسەیەکی گرنگە و هەر کۆمەڵگەیەك، بەخۆداچوونەوە و ڕەخنە لە خۆ گرتنی تێدا پیادە نەکرێت پرۆسەی گۆڕانیشی تێدا نایەتە کایەوە و وەك ئاوی مەنگ لەشوێنی خۆی دەمێنێتەوە، بەڵام لە پرۆسەی گۆڕان گرنگتر(گۆڕانە بەرەو کوێ؟!)

پێویستە گۆڕان بەرەو ئاسۆی گەشتر و بیری روناکتر و ژیانی مرۆڤانەتر و ئاسودەتر، هەنگاومان پێ هەڵبگرێت.بەرەو دەرککردن بە گرنگی رۆڵمان لە ژیاندا و ئەرکەکانی سەرشانمان و چۆنیەتی پیادە کردنی ماف و ئازادییەکانمان.ئەمانەش هەموو پێویستە پرەنسیپی چەسپاو لە کەسێتیماندا پراکتیزە بکەین، نەك تەنها بانگەشە و دروشم بن.گۆڕان پرۆسەیەکی گشتگیر و فرە رەهەندە، پێویستە کۆمەڵگە بە هەردوو رەگەزەوە پیادەی بکات.

سەرچاوە و فاکتەری سەرهەڵدانیشی بریتییە لەهۆشیاری و رۆشنبیری، کاتێك کە ژن و پیاو هۆشیار بن و گرنگی و رۆڵیان بزانن بە هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی،



کەسێتی خۆیان بۆ یەکتر بسەلمێنن،ئیتر بوار بۆ ڕێزنەگرتن و سوکایەتی و بەکەم سەیرکردن نامێنێتەوە.

بەڕای من، پرۆسەی گۆڕانکاری پێویستە لە هەموو بوارەکاندا بێتە ئاراوە، بۆ نموونە: ئەگەر دەوڵەت لە سیستمی سیاسیدا، دیموکراسی راستەقینە پیادە بکات، کەس بەهۆی ئینتیما و رەگەز و نەوە...هتد نەچەوسێنرێتەوە و هاولاتیان مافی هەڵبژارد و خۆ پالاوتن و دەست نیشانکردنی ئازادانەی نوێنەرەکانیان هەبێت و لە بواری ئابوری و کۆمەلایەتیشەوە، مافەکانیان لە دابینکردنی هەلی کار و خوێندن و شوێنی نیشتەجێبوون مسۆگەر بکرێت، پێموایە خەڵکی ئاسودەتر دەژین و بیر لە بەکارهێنانی توندوتیژی ناکەنەوە و هەست بەپاراستنی هاو کەرامەتی مرۆیی خۆیان دەکەن و لێرەوە بناغەی پرۆسەی گۆڕانکاری و بەرەو پێش چوون دادەمەزرێت.

لە روویەکی تریشەوە،(ئافرەت) خودی خۆی پێویستە بە خۆسەلماندن و خۆهۆشیارکردن هەیە، ئەوەی جێی سەرنجە، بەداخەوە زۆرجار ژنان سەرقاڵی شتیبچوك و کەم بایەخن، کەمترین بایەخ بە بواری خۆ ڕۆشنبیر کردن و هۆشیاری دەدەن، بەم هۆیەوە ناتوانن بەشداری لە

گفتوگۆ و مەسەلە جدیەكاندا بكەن و راوبۆچوونی تایبەتی خۆیان لەبوارەكانی سیاسەت و ئابوری و یاسا...هتد كاتێكیش باس لە پرۆسەی گۆڕانكاری لە بواری ئافرەتدا دەكرێت، ئەوەی كەتێبینی دەكرێت بەپێی پێویست باس لە گۆڕانی فرە رەهەند ناكرێت كە ئافرەت دێنێتە هەموو مەیدانەكانی‌ژیان و وزە و تواناكانی بۆ بەرژەوەندی خۆی و كۆمەڵگە بەگەڕ دەخات، بەڵكو تەنها تیشك دەخرێتە سەر پێویست گۆڕان لە رەوشتی پەیوەندییە تایبەتیەكەی نێوان ژن و پیاو دا، زۆرجار لە نوسین و لەڕێی كەناڵەكانی ترەوە، بانگەشە بۆ پەیوەندی لەدەرەوەی خێزان دەكرێت و هەوڵی ئاسایی كردنیشی دەدرێت، بێ ئەوەی باس لە بەرەنجامی ئەم بانگەشانە بكرێت و ئاسەوارەكانیشی لەسەر ئافرەت و پیاو و كۆمەڵگە و چوارەمیش كە رەنگە بێتە ئاراوە، كە ئەویش(منداڵ)ە، بە هەند بگیرێت.

ئەوەی جێی نیگەرانییە، لە كۆمەڵگەی ئێمەدا، ئەوەندەی لاسایی كردنەوەی بێ بیركردنەوە و چاولێكەری كاریگەری لەسەر گۆڕان و هەڵسوكەوت و بڕیاری خێزانەكان و ئەندامەكانی هەیە، ئەوەندە بڕیاری لۆجیكی و لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی راستەقینە لەئارادانییە.



كاتێك خێزانێك كۆچ دەكات بۆ هەندەران، نازانێ بۆ كۆچ دەكات؟ ئەگەر بیر لە پاشەڕۆژی منداڵەكانی بكاتەوە، رەنگە تەنها لە رووی پێداویستیە ماددیەكانەوە بێت.

لەزێد و زەمینەیەك هەڵیان دەكێشێت و لە زەمینە و واقعێكی تەواو جیاوازدا دەیانچێنێت و لە پاشانیشدا دەیەوێت وەك زەمینەكەی یەكەمجار نەشونما بكەن.

لەلایەكی تریشەوە گەنجەكان بری پێملكردنی ژیانیان لە هەندەران بۆ بەهێزكردنی كەسێتی رۆشنبیری خۆیان و بەدەست هێنانی بڕوانامەی زانستی لە بوارە جیاوازەكاندا، لەناو روكەشەكانی ژیاری رۆژئاوادا دەتوێنەوە.

بۆیە دەبینی بە گۆڕانی ژینگە و كۆمەڵگە،هەڵەكان دووبارە دەبنەوە، چونكە ناخەكان هەمان ناخن.

كەواتە پێویستە پرۆسەی گۆڕانكاری، لە ناخ و قەلآیی بڕوای مرۆڤەوە سەرهەڵبدات و هەر بەم شێوەیەش دەتوانێت خۆی و كۆمەڵگە بگۆڕێت نەك بەتەنها وەك ئامێرێكی بێ هەست و نەست خۆی بدات بەدەست دەورووبەریەوە.

*پێتوایە تەكنەلۆژیا تا چەند خزمەتی بە دۆزی ژنان كردووە، لە كاتێكدا لەڕێی كەناڵ و سایتە سێكسیەكانەوە قێزەونترین دیمەنی ژنان بلآودەكرێتەوە ؟

-بێگومان تەكنەلۆژیا وەك هەر داهێنراوێكی دیكەی چەكێكی دووجەمسەرییە، ئەو دەستەی كە بەكاریدەهێنێت دەتوانێت لەڕێگەیەوە گەورەترین خزمەت بە رۆڤایەتی بكات، لە هەمان كاتیشدا كەكرێت وەك هایدگەر دەڵێت؛ مرۆڤ بكاە بەندەی خۆی و لەوێرانكاری و بەها مادی و مەعنەوییەكاندا، بخرێتەگەڕ.

وەك هەموو توێژەكانی تر، تەكنەلۆژیا گەورەترین خزمەتی بەدۆزی ژنان كردووە، هەر لەكورتكردنەوەی ئەنجامدانی كارەكان، تا كردنی جیهان بە گوندێكی بچوك كە لەڕێی ئینتەرنێت و شۆڕشی زانیارییەكانەوە، رۆژانە دەتوانرێت هەواڵی كاروچالاكی و كۆنگرە و كێشە و ئاستەنگەكانی بزوتنەوەی ژنان لە سەرتاسەری جیهاندا بزانرێت.

دیارە ئەمەش بۆ خۆڕۆشنبیر كردن و گۆڕینەوەی ئەزمون و شارەزایی، هۆكارێكی زۆر گرنگە و هەقوایە هیچ كەس لێی دەستبەردار نابێت.

ئەمانە جگە لە ئاسانكردنی گەیاندنی دەنگ و راو بۆچوونەكان، بەهەموو جیهان و بە زمانە جیاوازەكان لەڕێی نمایشكردنی گۆڤار و رۆژنامە و بلاوكراوەكان، لە سایتەكانی ئینتەرنێتدا.



بەڵام ئەوەی جێی داخە، ئەم داهێنراوە ناوازەیە بۆ كاری ڤێزەونی بازرگانی سێكسی بەكاردەهێنرێت و بەنمایشكردنی دیمەنە ڤێزەونەكان بەها و كەرامەتی نەك تەنها ئافرەت، بەڵكو مرۆڤایەتی مرۆڤ سفر دەكەن بۆ خوار پلەی ئاژەڵیش دایدەبەزێنن، چونكە گیاندارانی دیكە پێیان قورسە دیەنی جوتبونی خۆیان نمایش بكەن، بەڵام(مرۆڤ) لەگەڵ ئەوەی رێزدارترین بەدیهێنراوی گەردونە، بەم كارە نەشیاوانە رێز و بەها و كەسێتی خۆی، سفر دەكات.

لەلایەكی تریشەوە ئاسەواری زۆر دزێو و نالەباری بۆ سەر گەنجان لە كچان و كوڕان هەیە چ بۆ هەڵسوكەوتی خۆیان و چ بۆ تێڕوانینیان بۆ پێگەی ئافرەت لە ژیاندا، لەبری ئەوەی(سێكس) وەك خۆی (هۆكار)ێك بێت لە ژیانی مرۆڤدا، دەكرێتە (ئامانج) و هەموو وزە و تواناكانیانی بۆ ئاراستە دەكرێت و نەك تەنها ئەوەندە بەڵكو بەرەو ژیانیریزپەڕ و شازەكان بانگەشەیان دەكات و ئەگەر خێزانیش پێكەوە بنێن، رەنگە نەتوانن ژیانێكی هاوسەرێتی ئاسایی بگوزەرێنن.

هەرچەندە بەپێی چەندین بڕیاری نێودەوڵەتی لەوانەش بڕیارەكانی كۆنگرەی پەكین و

ڕێکوتننامەی(CEDAW)، داوای قەدەغەکردنی ئە دیاردە قێزەونە کراوە، بەڵام ئەوەی دەبینرێت، نەك تەنها قەدەغە نەکراوە، بەڵکو جەستەی (ئافرەت) بۆتە ئامێری ڕەواج پێدانی کاڵاکان و لەسەر حسابی جەسە و هەستی، سەرمایەی ملیاردێرەکانە زیاتر و زیاتر کەڵەکە دەبێت و لەڕێی ریکلامەکانیشەوە دەیگەڕێننەوە بۆ کونجی مەتبەخ.

*ئەگەر دوا پرسیارم لەسەر خۆسوتاندن بێت ، پێتوایە خۆسوتاندن دەرئەنجامی چیە؟ چی وا لە ژنان دەکات بیر لەم ڕێگایە بکەنەوە، پێتوایە ئەمە چارەسەرە یان ئەو پەڕی بێتواناییی؟

-(خۆسوتاندن) دەرەنجامی حاڵەتێکی بێ هیوایی و بێ توانایییە لەبەردەم کێشە و ئاستەنگە بەرز و نزمەکانی ژیان، ئاسەواری پەروەردە و مامەڵەی هەڵە و فشاری زۆری دەرونی و کۆمەڵایەتی و داخستنی سەرجەم دەرگا و دەروازەکانی دیالۆگ و وتو وێژ و لێك حاڵی بوونە لە نێوان قوربانیەکە و دەوروبەریدا.

(خۆسوتاندن) نەك تەنها چارەسەر نییە، بەڵکو ڕێگایەکی کوشندەو هەڵەیە بۆ دەربازبوون لە واقیع، کە ئەگەر بەردنیش کۆتایی نەیەت، واقیعێکی تاڵتر بە هێنانە



کایەی جەستەیەکی شێواو، منداڵی بێناز بێ چارە دەروون شێواو و کێشەی گەورەتر دێتە ئاراوە.

ئەمە جگە لە چەندین قسە و باس و چیرۆکی هەڵبەستراو سەبارەت بە هۆکاری خۆسوتاندنەکە کە کاریگەری زۆر نێگەتیڤانە لەسەر دەروونی منداڵەکان بەجێ دەهێڵێت و ئاسەواری تا کۆتایی ژیانیان درێژەی دەبێت.

لێرەوە بانگەشەی ژنان دەکەم کە لە کێشەکانیان گەورەتربن، شێرە ژنەکانی میلەتەکەیان بکەنە پێشەنگی خۆیان لە ئارامگرتن و کۆڵنەداندا، ئەوانەی لە سەختترین ساتەکانی تەمەنیاندا، لەگەڵ ئەوەی بێ کەس و هەندێجار بێ هاوسەر بوون، بە ڕەنجی شانی خۆیان بە کشتوکاڵکردن وتەشیڕستن و لفکەچنین، نەك هەر سەربەرزانە منداڵەکانیان پەروەردەکردووە و خزمەتی شۆڕش و خەبای سیاسی میلەتەکەشیان دەکرد.

بەداخەوە زۆرجار خۆسوتاند لەسەر کێشەی بچوك و داواکاری ماددی زۆر سادە و روکەشە، هەڵچونێکی بێ بیرکردنەوەیە کە پەشیمانی یەکجارەکی دنیا و پاشەرۆژیشی لە دواوەیە.

هیوادارم ژنان پیاوان هۆشیارانەتر لە ژیان کێشەکان بڕوانن و لە خێزانەکانیشیاندا هۆشیارانە مامەڵە لەگەڵ ڕۆڵەکانیاندا بکەن بە هاوڕێیەتی کردن و ڕێزگرتن و هاوسۆزی دەربڕین، دەرگای دەربڕیان دیالۆگ لە بەردەمیاندا والا بکەن تا پەنا بۆ ڕێی هەڵە و چارەی نەشیاو نەبەن.

هەروەها پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکان لەسەر بناغەی ڕێز و خۆشەویستی دابمەزرێت بە خۆهەڵخەڵەتاندن لە ژیاری دەوروبەر، زیندەگی نەکرێتە دۆزەخ لەیەکتر، وەك ئەوەی هەندێ لە بوك و ماڵە خەزوران بەرامبەر یەکتری دەینوێنن سەر ئەنجامیش هەڵچوون و ناکۆکی و کارەسات سەرهەڵدەدات. پاشانیش بەڕێوەبەر و مامۆستایان دەتوانن لە خوێندنگە ناوەندی دواناوەندیەکاندا هۆشیاری بدەنە کچان و ئەگەر یەکێکیان توشی کێشە هات هاوکاری بکەن و بەجگەرگۆشەی خۆیانی بزانن، نەك بە بڕیاری هەڵە و بێ بیرکردنەوە بیان خەنە نێوان دوو بەرداشی کالفامی خێزان و سەرکوتکردنی خوێندنگە. وەك نمونەی ئەو خوێندکارەی لە دووەمی ناوەندی لەسەر نامەیەك پاش هەڕەشەی بەڕێوەبەری خوێندنگەکەیبە گەیاندنی بە ماڵەویان، خۆی سوتاند و گیانی لە دەستدا. جێی داخە کە



ئافرەتێکی دایك خاوەن ئەزموون و بڕوانامە و تەمەن خۆی لە بیر بکات کە ڕۆژێك لە ڕۆژان بە قۆناغی هەرزاکاریدا تێپەڕیوە و لەبری ڕێنمایی و ئاڕاستەکردنی ڕاست و دروست بەو شێوە ناشارستانیە مامەڵە لەگەڵ کچێکی تەمەن (١٤)ساڵدا بکات.

# دیداری د.روئیا تلووعی



*دۆزی ژنان لە جیهاندا چۆن دەبینیت بە گشتی و دۆزی ژنانی کورد لە چ ئاستێکدایە؟

–دۆزی ژنان لە جیهاندا بەرەو گەشەی ژن و گەیشتن بە برێك لە مافەکانی دەبینم هەرچەند ژن هێشتا بە تەواوی نەگەیشتۆتە ئەو پێگەی مرۆڤایەتیە کە شیاویەتی، بەڵام هەوڵەکان زۆرتر و رێكوپێکتر بوون و سەرکەوتنی ژنان بەرچاوە. ناوی ئافرەتی کورد کە دێتە گۆڕێ بێ راوەستان دەبێ دۆخی کورد سەیر کرێ. کورد لە چوار پارچە دەژی کە هاوکات لەگەڵ هاوبەش بوونی کێشەکان برێك جیاوازیشی هەیە. هەلومەرجی هەموو پارچەکان وەك یەك نین. پارچەی باشوور ئازادتر پارچەکانیترە. خەباتی باکوور بەرچاوتر لە خەباتی رۆژهەڵاتە. بزاڤی رۆشنبیری رۆژهەڵات هەوڵێکی زۆری هەیە. ئافرەتی کورد بە تایبەت لە باشوور خەریکی ئەزموونی بزووتنەوەی فمێنیستی خۆیەتی و من هەوڵەکانیم پێ پیرۆزە. بەڵام لە رۆژهەڵات هێشتا بزووتنەوەی فمێنیستی ژنانی کورد فۆڕمی نەگرتووە و کێشەکان ئێجگار زۆرن. دیارە ژنانی کورد بە گشتی تا گەیشتن بەو پێگەی کە ژنانی وڵاتانی پیشەیی پێشکەوتوو پێی گەیشتوون رێگایەکی زۆریان ماوە.

*پێتوایە لە کوردستاندا بزاڤێکی داکۆکیکەری تەواو لە مافەکانی ژنان هەبێت یان سەرجەمیان لە ژێر چاودێری حزبەکاندان؟

–دیارە لە کوردستان بزاڤی داکۆکیکەری مافی ژنان هەیە و نکوولی لەوە ناکرێ. بەڵام بۆ ئەوەی کە سەرجەم لە ژێر چاودێری حزبەکانن یان نا دەبێ بڕوانینە واقیعی کۆمەڵگا. ئێمە لە جیهانی سێیەمدا دەژین یان دەتوانم بڵێم لە دابەشکردنی نوێدا ئێمە باشوورین نە خەڵکی باکووری جیهان. ئێمە هێشتا ئەزموونی دیموکراسیمان بە تەواوی نیە. کولتوورمان دیموکرات نیە. ژێرخانە کۆمەڵایەتی و کولتووری و سیاسی و ئابووریەکانمان هێشتا خێڵ و عەشیرەییە و کاریگەرێتی فیۆدالیزمی هەر تێدا دیارە. لە ئاوەها کۆمەڵگایەکی جیهان سێیەمیدا وەك زۆربەی جیهان سێیەمیەکانیتر چۆن دەتوانین چاوەڕوانی ئازادیەکی تەواو بین؟ ئازادی کولتووری دەوێ. دیارە دەسەڵات هەر بەسەر ڕێکخراوەکاندا ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ زاڵ دەبێ. گرنگ ئەوەیە لەم بارودۆخە لەگەڵ هەوڵ بۆ دروست کردنی ژێرخانەکان باشترین کەڵك وەرگرین و هاوکاتیش هەوڵ بدەین ئازادتر بین و ئەو چاودێریە کەمتر کەین.

لە ڕاستیدا (NGO ) واتە ڕێکخراوەی ناحکوومی و نابێ لە ژێر چاودێری دەسەڵات و سیاسەتدا بێ.



*بەڕای بەڕێزت ڕێکخراوەکانی ژنان توانیویانە بەدیهێنەری مافەکانی ژنان بن؟ ئایا تا چەند لەم ئەرکەدا سەرکەوتوو بوون؟

–ڕێکخراوەکان دەبێ هەوڵ بدەن بۆ ئاگایی ژنان لە مافەکانیان و لە لایەکی تریشەوە زەخت خستنە سەر دەسەڵات بۆ ئاڵوگۆڕ لەو یاسایانەی کە دژ بە ژنە و پەسندی یاساگەلێك کە بە بەرژەوەندی ژنانن.

دیارە لەم بوارانەوە لە لایەن ڕێکخراوەکانی ژنان هەوڵ دراوە، بەڵام هەروا کە ئاماژەم کرد ئێمە هێشتا لە سەرەتادایین و ڕێگایەکی زۆرمان لەبەرە. دیارە دەبێ هەوڵ بدرێ کە هەموو ژنان بە تایبەت ژنانی کابان و ژنانی دێهاتی ئاگایی و زانستیان بچێتە سەر و سەبارەت بە مافەکانی خۆیان وەك مرۆڤ ئاگاداریان پێ بدرێ و بە فێر کردن و بە توانا کردنیان هەوڵ بدەین سیستمی پەروەردەش چ لە نێو بنەماڵە و چ لە خوێندنگەکان وا بگۆڕین کە چەمکی جیاکاری نێوان کچ و کوڕ لێ وەسڕین. کاتێك ڕێکخراوەکان بە تەواوی سەرکەوتوون کە بگەنە ئەو ڕادەی کە زۆرینەی ژنەکان بەم شێوە ڕابێن و دیارە جارێ ئەوە بەدی نەهاتووە.

*کەسێتی کوردی کەسێتیەکی نەگۆڕاوە بە تایبەتی پیاو، کە پاش ئەم هەموو پێشکەوتنەی جیهان هێشتا بە تۆمەتی شەرەف و شتیتر ژنان تیرۆر دەکرێن و ئەمەش تەنیا لە کوردستان نیە،

بەڵکو لە ئەورووپاش روو دەیدا، وەکو تیرۆر کردنی "فادیمە" و ئەوانیتر. پێت وایە هۆی نەگۆڕانی عەقڵی پیاوی کورد چییە؟ لە کاتێکدا ژینگە و کۆمەڵگاش گۆڕاوە.

-من لەسەر ئەو بڕوا نیم کە کەسیەتی ئێمە نەگۆڕاوە و عەقڵی پیاوی کورد هەر ئەو عەقڵە کۆنەیە. دەزانن بۆ؟

بۆ ئەوەی ئەگەر هێشتا تاقمەیەك هەن کە عەقڵیەتی کۆنیان هەیە و ژن لەسەر شەرەف دەکوژن، تاقمەیەکیش هەن کە دژ بەو کردەوەن و ئەمانە بریتیین لە ژنیش و پیاویش. پیاویشمان هەیە کە خەریکی ئیشی فەرهەنگیە و رووناکبیرە و تێدەکۆشێ و هەڵسوکەوتیشی لەگەڵ ئەوانەی پێشوودا جیاوازە و بە تایبەت لە جیلی نوێدا ئەمە دەبینین. من ناتوانم بە حوکمی تاقمەیەك کە ژن کوژن هەموو پیاوی کورد بە کۆنەپەرست دانێم و بە حوکمی تاقمەیەکیش کە نوێخوازن دیسان بڵێم هەموو پیاوی کورد نوێخوازە و عەقڵیەتی گۆڕاوە. ناموسکوژی و خۆسووتاندن و توندوتیژی دژ بە ژنان جاران بووە و ئێستاش هەیە، بەڵام ئیمڕۆ زەق دەکرێتەوە و راگەیاندن لەسەری هەیە و دەکەوێتە بەر باس‌وخواس. ئەمە نیشان دەدا عەقڵیەتی کۆمەڵگای ئێمە لە گۆڕان بەرەو باشیدایە. ئەو رەوتەش زەمەنی پێویستە و دیارە کتوپڕ عەقڵیەتی هەموو چاك ناکرێ. ئەوەی تەسك‌بینە تا کاتێك ریفۆرمێکی فیکری لە خۆیدا نەکا لە ئەورووپاش بێت یان



ئەفریقا یان کوردستان هەر تەسکبین دەبێ. ئەوەی خۆی لە تەسکبینی رزگار کردبێ لە هەر شوێنێکی جیهان بێ هەر ئازاد بیر دەکاتەوە، بەڵام دیارە ژینگە و کۆمەڵگا لەم کەسەدا کاریگەرێتی ئەوەی دەبێ کە فیکر و توانای گەشەی زیاتر بکات یان رێگای لێ بگرێ و کەندوکۆسپی بۆ ساز کات.

*پێتوایە تەکنولۆژی تا چەند خزمەتی بە دۆزی ژنان کردووە لە کاتێکدا لە رێی کەناڵ و سایتە سێکسیەکانەوە ڤێزەونترین دیمەنی ژنان بڵاودەکرێتەوە؟

—تەکنولۆجیا و ئامێرە نوێکانی پێوەندی گشتی وەك هەموو شتێکیتر دەتوانین کەڵکی چاکی لێ وەرگرین یان کەڵکی خراپ. لە لایەکەوە بە داخەوە ژن دەبێتە ئامرازێك بۆ سێکس و وێنەی ڤێزەونی لێ بڵاو دەکرێتەوە و بە داخی زۆرتریشەوە یەك دوو ژنی کوردیش هەن کە لە چەتەکاندا خۆیان بە لایەنگری حزبێکی ئێرانی دەناسێنن و لە کامێرادا بۆ پیاوان رووت دەبنەوە و ناویشی دەنێن عیشقی ئازاد!!

لە لایەکی تریشەوە ژنانی کورد سایتی ئینتەرنێتی خۆیان هەیە وەك jinname و نووسینەکانیان بڵاو دەکەنەوە و کۆڕ و کۆمەڵ و کۆنفرانس دەگرن و کێشەکانیان دەخەنە بەر باس و وتووێژ. ئەوەی کە هەرکەس چۆن بیەوێ لەم ئامێرانە کەڵك وەرگرێ ماوەتەوە سەر خۆی. بە گشتی من گەشەی تەکنولۆجیا

به پیرۆز دەزانم و پێم وایە بۆتە هۆکاری پێوەندی ژنان و پیاوانی خاوەن بیروبڕوا پێکەوە و جیهانی بچووك کردۆتەوە.

*بزاڤی فمێنیستی لە ئێران بە گشتی و کوردستانەکەی چۆن دەبینیت؟

–بزاڤی فمێنیستی لە ئێران هەر چەند ڕێبەرایەتیەکی دیاری نیە و چڵوپۆی زۆرە و ژنە دەوڵەتیەکانیش هەوڵ ئەدەن بە زۆر دوو وشەی فمێنیزم و ئیسلام بخەنە لای یەك و هەرچیش دەکەن ئەم دوو وشە وەك دوو جەمسەری هاوناوی مغناتیس هەر یەك ناکەون، بەڵام بە هۆی هەوڵ و تێکۆشانی ژنانی ناحکومی و ژنانی خوێندەوار و نووسەر و... بنەمایەکی دیموکراتیکی هەیە و چالاکی و پێوەندی بە ژنانی‌تری جیهانەوە زۆرتر بووە.

ژنانی ئێران بوونەتە کۆسپێکی گەورە بۆ کۆماری ئیسلامی. بەشداریان لە هونەر و سینەما و چاپەمەنی و نووسیندا زۆر بووە و جیلی نوێش تەنانەت بە شێوەی جلوبەرگیەوە بە تایبەت لە تاران، دژایەتی بایەخە داسەپاوەکانی دەسەڵات دەکەن. هەڵبەت نابێ چاوپۆشی لە گرفتە کۆمەڵایەتیەکان و قەیرانگەلێك وەك پەرەسەندنی کێشەی ژنانی خیابانی و لەشفرۆشی و ئیعتیاد و خۆکوژیش بکەین. لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان هێشتا بزووتنەوەی فمێنیستی لە سەرەتای



جموجۆڵدایە و نەیتوانیوە خۆی ڕێك بکات و سازمانێك بە خۆی بدات. تێکۆشانە بەرچاوەکان زیاتر تاکەکەسین.

# دیداری بەناز کوێستانی



٭دۆزی ژنـان لەجیهانـدا چۆن دەبینیـت بەگشتیو دۆزی ژنانی کورد لەچ ئاستێکدایە..؟

-دەکرێـت دۆزی ژنـانی جیهـان بکـەین بـەدوو بەشـەوە، وڵاتـانی خۆرئـاواو پێـشکەوتوو، لەگـەڵ وڵاتـانی دواکـەوتوو، بۆیەکـــەمیان رەنگـــە تارادەیـــەك ژنـــان توانیبێتیـــان مافـــەکانیان دەســـتەبەر بکـــەنو بتـــوانن وەك مرۆڤێکـــی ئاسـاییو پلـە یـەك حـسابیان بـۆ بکرێـت لـەناو کۆمەڵگـەدا، کـەبێگومان ئەمـەش بەتـەنها بەجوهـدی خۆیـان نـەبووە، راســتە خۆیــان خــەباتێکی زۆریــان کــردووەو خــوێنێکی زۆریــشیان رشــتووە، چــەندەها رێکخــراوی فیمینیزمـــیو داکۆکیکەریان لەمافەکانی ژنان دروست کـردووە، کـەداکۆکی لـەمافو ژیـانو شـەرەفو کەرامـەتیان دەکـاتو توانیویانـە کۆمەڵـە بەربەرسـتو ئاسـتەنگێکی زۆر بـبڕنو ئـەو دابو نەریتو کەلتورە کۆنانە هـەرەس پـێ بهێـنن کەبۆتـە رێگـر لەبـــەردەم خواســـتو ئـــاوات داخوازیـــەکانیان، هـــەروەها بوونەتـە هێزێکـی گوشـار بـۆ گـۆڕینی یاسـای وڵاتـەکانیان، کـەبێگومان هـەموو گۆڕانکارییـەکی بنـەڕەتی لەیاسـای ئـەو وڵاتــەوە دەســت پــێ دەکـات، هەریاسـایە سـەروەری گـشت گۆڕانکاریـــەکان، کـــەوای لـــەژنان کـــردووە لـــەو وڵاتانـــەدا

کەماف‌و دەنگیان بەپلەی یەکەم بێت‌و لەپێش پیاوانەوە بن بۆ هەموو کارو داخوازی‌و مافێك، هەر لەمافی هاوسەرێتی‌و دایکایەتی‌و جیابوونەوەو ئابوری سەربەخۆ...هتد گشت لایەنەکانی ژیانیان بۆ دابینکراوە.. هەموو جۆرە خزمەتگوزاریەکیان بۆ دابینکراوە وەك مافی دایکایەتی‌و چاودێری منداڵ‌و دایەنگەو تەنانەت لەهەندێ دەوڵەتدا خەرجی ژیانی منداڵەکانیشیان بۆ دابین دەکرێت... بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو پێشکەوتنانەشدا دەبینین.. چەوساندنەوەی ژنان لەو وڵاتانەدا هەر دەکرێت‌و هەندێجار حاڵەتی کوشتنیش روودەدات.. ئەمە جگە لەوەی کەهەندێجار جەستەی رووتی ئافرەت وەك کالایەك بازرگانی پێوە دەکرێت‌و لەکەناڵ‌و هەندێك شوێندا بەمەبەستی تایبەتی بەکاریان دەهێنن..

بەڵام دەکرێت بڵێین تارادەیەکی زۆر باش لەگەڵ دۆزی ژنانی کورددا جیاوازییەکی زۆری هەیە، ئافرەتی کورد بوونەوەرێکی گوناهو زوڵم لێکراوە لەهەموو بوارەکانی ژیاندا بەتایبەتیش ژنانی نەخوێندەوارو گوندەکان‌و گەڕەکە هەژارنشینەکان‌و ئەو ژنانەی کەعەقڵی باوکسالاری زاڵە بەسەریانداو دەبێت لەژێر ئەوامرو عەقڵیەتی ئەو



پیاوەدا رەفتار بکات‌و جل بپۆشێت‌و بۆی نییە بەبێ پرسی ئەو بچێتە دەرەوە کەئەم حاڵەتە تاوەکو ئێستاش لەزۆربەی ماڵ‌و کۆمەڵگەدا پەیرەو دەکرێت، ئەمە جگە لەوەی کەبەبیانووی لەکەدارکردنی شەرەف‌و کۆمەلێك بیانووی بێ بنەما ژن تیرۆر دەکرێت یان سەرەونگوم دەکرێت یان وای لێ دەکرێت کەخۆی بەدەستی خۆی لەناو بەرێت‌و خۆی بسوتێنێت.

*پێتوایە لەکوردستاندا بزاوتێکی داکۆکیکەری تەواو لەمافەکانی ژنان هەبێت، یان سەرجەمیان لەژێر چاودێری حزبەکاندان..؟

-هەموو کۆمەلگەیەکیش کۆمەلێك خاڵی سلبی‌و ئیجابی هەیەو لەپاڵ دەرکەوتنی ئەو هەموو دواکەوتووییە بەعەقڵیەتی کۆمەڵگەی کوردەوارییەوە، کۆمەڵێك کەسایەتی‌و رێکخراوو گروپ‌و تاقمی باشییش هەن کەکار بۆ مافەکانی ژنان‌و داکۆکیکردن لەماف‌و خواست‌و ئاواتەکانیان دەکەن و وەك بزووتنەوەیەکی نوێگەری‌و بونیادنەری بواری ژنان سەری هەڵداوە ، هەرچەندە بەژمارە کەمن، بەڵام توانیویانە دەورو کاریگەریەکی باشیان لەسەر کۆمەڵگەو کۆمەڵێك بڕیاری سیاسی‌و کۆمەڵایەتی هەبێت‌و شوێن‌و پەنجەیان لەو بوارەدا

دەرکەوتووە. بەڵام ناکرێت بووترێت کەبزاوتێکی داکۆکیکەری تەواو لەمافەکانی ژنان لەکۆمەڵگەی کوردیدا هەیە، ئەو رێکخراوە سەربەخۆیانەی کەتایبەتە بەم بزاوتەو سەر بەهیچ لایەنو حزبو تاقمێك نین تازە بەتازە سەر هەڵئەدەنو یەکە یەکە دەردەکەون.. دەیانەوێت بەردێك زیاتر لەبناغەکەدا دابنێن، پێم وایە هۆی درەنگ دەرکەوتنی ئەم بزاوتەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بارو زروفەی ئەوسای کوردستان کە ئابلۆقەیەکی ئابوری تەکنەلۆجی فیکریو فەلسەفی لەسەر ناوچەکە هەبوو هەموو دەرگاکان بەرووماندا داخرابوو، دەروازەیەك نەبوو لێوەی دەنگی خۆمان بگەیەنینە رێکخراکانی ژنانی جیهانو ئەو هەموو رێکخراوە خێرخوازەکانی کەئێستا لەکوردستاندا کاردەکەنو پاڵپشتی تەواویان دەربڕیووە بۆ بزووتنەوەی ژنانو گەشەکردنی.

*بەرای بەرێزت رێکخراوەکانی ژنان توانیویانە بەدیهێنەری مافەکانی ژنان بن، ئایا تاچەند لەم ئەرکەدا سەرکەوتوو بوون..؟

-هەڵبەتە بوونی رێکخراوەکانی ژنان توانیویەتی پردێك بێت بۆ هێنانە دەرەوەی ژن لە ماڵەوە بۆ شەقامو



کارکردن لەرێکخراو دەزگاکاندا، با ئەوەمان بیر نەچێت ئەوەیان کارێکی کەم نییە، بۆئەوەی بتوانین بڵێین کە رێکخراوەکان کەمو کورتیان هەیە لەبەرامبەر ئەرکەکانیان، بەڵام ناکرێت هەموویان وەك یەك سەیر بکەین، چونکە ڕێکخراوی وای تیادا هەیە، تەنیا بۆرازیکردنی حزبەکەی کاردەکات، لەهەمان کاتدا ڕێکخراوی واهەیە هەموو خەمی لەوەدا کۆبۆتەوە کە لەرێگەی بەئەرشیفکردنی تاوانەکانی توندوتیژی، ئەم ولاَتە وەك جەنگەلستانێك دەربخات، بێگومان ئەوەش ئایدیۆلۆژیایەکی سیاسی لەپشتەوە وەستاوە، لەهەمان کاتدا ئێمە ڕێکخراوی چالاکی وامان هەیە کەلەپێناو بزووتنەوەی ژناندا دەسکەوتی مەزنیشی بەدەست هێناوە، بۆیە لەو کاتەدا هەڵەیەکی گەورە دەکەین هەموو رێکخراوەکان بەیەك چاو سەیر بکەین، ئەوە رقێکی نێرانەی توندڕەوە نایەڵێت جیاوازیەکانی ژن ببینین، هیوادارم لەو دەستەواژەیە هەڵەم نەکردبێت، چونکە عەقڵی باوکسالاری ناو ئەو جۆرە تێفکرینە توانای ئەوەی نییە هێزی ژن ببینێت لە بەشداریکردنیکۆمەڵگادا. بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا بێگومانبە لەوەی کەراگەیاندنەکانی رێکخراوەکانی ژنان کەم تا زۆر شوێن دەستیان دیارە،

لەدەرخستنی کێشەو کەمو کوڕییەکانی ناو کۆمەڵگەی کوردەواری، هەندێ جاریش ویستویانە لەو ڕێگەیەوە کۆمەڵگە بەرەو مەدەنیەتو دیموکراسیو یەکسانی مافەکان بەرن، ئەمەش هەموو راگەیاندنەکانی هەموو ڕێکخراوەکان ناگرێتەوە هەروەکو لەسەرەوە باسم کرد، چونکە هەندێ ڕێکخراو ڕەنگە بڵاوکراوەشیان هەبێ، بەڵام بڵاوکراوەکەیان لەچوارچێوەی حزبەکەی خۆیان دەرناچێتو تەنها بەسەر ئەندامە حزبیەکانی خۆیاندا دابەشی دەکەن بەتایبەتیش لێپرسراوو عەقڵە پیاوسالارییەکانی بەڕێوەبەری ئەو ڕێکخراوە، ناوەرۆکو بابەتەکانیش بەخواستو ویستی ئەوان دەنووسرێت جا ئەو جۆرە بڵاوکراوەیە دەبێ چ خزمەتێك بەتوێژی ژنان بگەیەنێت.

بۆیە دەکرێت هەر ڕێکخراوێکی ژنان لەرێگەی کارو چالاکیو بەرهەمەکانیانەوە ئەركو سەرکەوتنیان دیاری بکرێتو ئاماژەی پێ بدرێت، بێگومان چاوی جەماوەریش بۆ ئەو شتانە تیژەو دەتوانن جیاوازی نێوانیان ببینینو هەڵیان بسەنگێنن.



★کەسێتی کوردی کەسێتییەکی نەگۆڕاوە، بەتایبەتی پیاو، کەپاش ئەم هەموو پێشکەوتنەی جیهان هێشتا بەتۆمەتی شەرەفو شتی تر ژنان تیرۆر دەکرێن، ئەمەش تەنها لەکوردستان نییە، بەڵکو لەئەوروپاش روویدا وەکو تیرۆرکردنی (فادیمە)و چەندانی تر، پێتوایە هۆی نەگۆڕانی عەقڵی پیاوی کورد چییە؟ لەکاتێکدا ژینگەو کۆمەڵگاش گۆڕاوە..؟

-تیرۆرکردنی ژنان بەهەر بیانوویەك بێت، تاوانێکی گەورەیە دەرهەق بەتوێژی ژنانو بەکۆمەڵگەو بەمرۆڤایەتی دەکرێت، پێشتر لەسەردەمی رژێمی بەعسدا ژمارەیەکی زۆر لەژنان تیرۆرو شوێن وندەکران بەبێ ئەوەی نەناویان بێت نە هیچ کەسو لایەنێك بۆی هەبێ باس لەو کێشانە بکات، کەئەمەش بۆ توندوتیژی ئەو رژێمە دەگەڕایەوە کەکەس نەیدەوێرا بەئاشکرا باس لەو زوڵمو زۆرو کوشتنو بڕینە بکات، بەڵام لەدوای راپەڕینو گەشەکردنی کەناڵەکانی میدیاوە پەردە لەسەر گشت ئەو تاوانانە هەڵدرایەوەو، ئەنجامدانی هەر تاوانێك ئاشکرا دەکرێتو بەروونی لەگشت کەناڵەکانی راگەیاندنەوە باس دەکرێت، بەتایبەتیش دەنگدانەوەی کوشتنی ژنانی کورد لەهەندەران کەئەمە خۆی لەخۆیدا، رووی دزێوی ئەو

جۆرە کەسانە دەردەخات کەسەر لەخۆیانو ماڵو منداڵیان دەشێوێنن لەپێناوی گەیشتن بەهەندەراندا، بەڵام کاتێك دەگەنە ئەوێ نەدەتوانن لەگەڵ ئەو کەشو هەوایەی ئەوێدا هەڵ بکەن وەك هاوڵاتیەکی ئەوێ لەگەڵ کلتورو رۆشنبیریو پەیوەندییەکانی ئەوێدا بژین، نەدەشتوانن وەك کوردێك بەگۆشەگیری لەو وڵاتانەدا بژین، ئەمە جگە لەوەی کە نێرینەی کورد لەهەندەران هەموو شتەکانو گۆرانکاریەکانو خۆشیەکان بۆخۆی بەحەڵاڵ و بەرەوا دەبینێت لەکاتێکدا بەبەرامبەرەکەی، جا ئەوە کچی بێت، یان خوشکی یان هاوسەری بەحەرام دەبینێتو نابێتو ناشێت مومارەسەی حەزەکانی خۆی بکات وەك ئەو، لەکاتێکدا ئەو ئافرەتە هیچ تاوانێکی نییە کەبەزۆر لەکۆمەڵگەی خۆی دایدەبڕنو دەیبەنە هەندەرانو لەوێش بێبەشی دەکەن لەحەزو ئارەزو سەربەستیەکانی خۆی، نموونەشمان زۆرە کەنەیانتوانییوە ئەو واقعە قبوڵ بکەنو کچەکانی خۆیان کوشتووە،وەك: فادیمە، پیلا..هتد چەندانی تری وەك ئەوان.

بەڕای من لەم سەردەمەدا کەبەسەردەمی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاو بەرەو پێشەوەچوونی جیهانو دنیای مەدەنیو جیهانگیری ناو دەبرێت، نەگۆڕانی کەسایەتی



پیاوانی کورد، دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێکی تێکهەڵکێش کەدەکرێت بەسەرەتایترین هۆکار دەست پێبکەین: ئەویش جیاوازی پەروەردەی منداڵی کوڕو کچە لەناو خێزاندا، بەتایبەتیش لەتەمەنی منداڵیدا کەیەك ساڵ تا شەش ساڵ دەگرێتەوە، کەدایكو باوك بەجۆرێکی وا پەروەردەیان دەکەن، هەر لەجلو بەرگو جۆری یاریو جۆری قسەکردنو تەنانەت جۆری ئەو وشەیەش کەبەکاری دەهێنن، کاریگەرییەکی سلبی دەکاتە سەر کەسایەتیانو دروستکردنی جیاوازییەکی بونیادی جەستەییو عەقڵیو فیکریان لادروست دەکات، کەلەداهاتووی تەمەنیاندا رەنگ دەداتەوەو تەواو گەشە دەکاتو گەورە دەبێت لەگەڵیاندا. دەکرێت خاڵی دووەم: خوێندنگە بێت، چونکە بەراستی جیاکردنەوەی خوێندکاری کوڕو کچ لەرووی مامەڵەکردنەوەو جیاکردنەوەی شوێنی دانیشتنیانو تەنانەت جیاکردنەوەی یاریو کەلو پەلەکانیان، جگە لە نادروستیو کەمو کوری زۆر کەلەمەنهەجی خوێندندا هەیە، هەر لەپۆلی یەکەمی سەرەتاییەوە هەتا دوا قۆناغەکانی زانکۆ، هەروەها مامەڵەی جیاوازی مامۆستایان کاریگەرییەکی گەورە دەکاتە سەر لایەنی دەروونیو بیرکردنەوەی ئەو کەسایەتیانە بەشێوەیەکی زۆر قوڵ

لەناخیاندا رەگو ریشەی خۆی دادەکوتێ کەمەحاڵە بتوانن وا بەئاسانی گۆڕانکاری تیادا بکرێت، سەرباری ئەمانەش کۆمەڵێك هۆکاری ژینگەیی گەورە هەیە وەك: دابو نەریتو ئەو کلتورەی کە بەجێ ماوە و هەروەها ئاین کەرۆڵی بەرچاو دەگێرێت لەدروست کردنی جیاوازیی گەورە لەنێوان رەگەزی نێرو مێو چەسپاندنی ئەو بیرو باوەڕە سواوو کۆنانە لەناخی مرۆڤەکاندا بەتایبەتیش پیاوان کە جۆرە غرورو خۆ بەزل زانینێکی باش لەکەسایەتیاندا دروست دەبێتو خۆیان بەبەرپرس دەزانن بەرامبەر بەرەگەزی دووەمو بەخۆیان رەوا دەبینن لەبوارەکانی ژیاندا بڕیار لەجیاتی تۆی ژن بدەن.

هەر ئەو خاڵانەی سەرەوە وایکردووە کە بەئاسانی کەسایەتی پیاوانی کورد نەگۆڕێنو هەست بەپێشکەوتنو گۆڕانکارییە گەورەکان نەکەن لەجیهانداو هەر بەعەقڵیەتی پیاوسالاری باوكو باپیرانیان بیردەکەنەوەو بڕیار لەسەر مەسەلە چارەنووسسازەکان دەدەن.

سەرەرای ئەوانەش تروسکاییەك بەدی دەکرێت لەناو پیاواندا، کەئەوانیش دروست بوونی نوخبەیەکە لەناویاندا کەرۆشنبیرنو خاوەن هەڵوێستنو پشتگیری دۆزی ژنان دەکەن لەناو کۆمەڵگەدا چالاکن.



*پێتوایە تەکنەلۆژیا تاچەند خزمەتی بەدۆزی ژنان کردووە، لەکاتێکدا لەرێی کەناڵو سایتە سێکسیەکانەوە قێزەونترین دیمەنی ژنان بلاودەکرێتەوە..؟

-دەکرێت بڵێین تەکنەلۆژیا ئەو دەروازە گەورەیەیە کەدەتوانێت خزمەتێکی گەورە بەهەموو بوارەکانی ژیانی مرۆڤایەتی بکات، کەبێگومان ئەمەش دوولایەنەیە رەنگە زەرەریشی هەبێت، بەڵام سوودو قازانجەکەی زۆر زیاترە لە لایەنە سلبیەکەی.

ئەگەر بەشێوەیەکی راست و دروست تەکنەلۆژیا بۆ خزمەتی مرۆڤایەتیو کێشە کۆمەڵایەتیەکان و ئالۆگۆڕکردنی زانیاری و... هتد، بەکار بهێنرێت، بێگومان دەبینین لەوەی کە لایەنێکی زۆر ئیجابییە، بەتایبەتیش لەبواری ژنانو ژناندا، هەر بەهۆی تەکنەلۆژیاوە دەتوانین ئاگاداری گشت ئەو رووداو هەواڵە دڵتەزێنو توندوتیژیانە بین کەلەسەرانسەرو لەهەر کونجو کەلەبەرێکی گێتیدا روودەدات، بەماوەیەکی زۆر کەم، ئەمە جگە لەوەی کەژنانی کورد توانیویانە سودێکی باشی لێ وەربگرنو چەند سایتێکی تایبەت بەژنانی کورد بکەنەوەو وتارو زانیاریو بیرو بۆچوونەکانیان

لەورێگەیەوە ئاڵوگۆڕ پێ بکەنو دەنگی خۆیان بگەیەنن بەگشت دونیاو ڕێکخراو کۆمەڵەو کەسایەتییە جیهانیەکان.

بەڵام ئەگەر کۆمەڵێك کەس یان گروپ یان لەسەر ئاستی تاکە کەسیش تەکنەلۆژیا بەمەبەستی خراپ بەکار بهێنێتو کۆمەلێك سایتی سێکسی تیادا پەخش بکەن، کەکاریگەری دەکاتە سەر لایەنی دەروونیو بیرکردنەوەی ئەو کەسانەی کەبەکاری دەهێنن، بەتایبەتیش لاوانو هەرزەکاران، بەکارهێنانی ئەو سایتانەش ئاستی ڕۆشنبیریو مەعریفی ئەو کەسە خۆی دەردەخات ، چونکە تاك خۆی بەرپرسە بەرامبەر بەکارو هەڵوێستەکانی لەناو کۆمەڵگەدا بەپلەی یەکەم ، پاشان کۆمەڵگەو خێزان بەرپرس دەبن بەرامبەری.راستە لاوان پێویستیان بەرۆشنبیری سێکسی هەیە، بەڵام دەکرێت ئەوە لەرێگەی خوێندنەوەی کتێبو بابەتی زانستیەوە بەدەستی بهێنن، بۆیە پێویستە هۆشیاریو ئاستی ڕۆشنبیری لاوان و هەرزەکاران بەرز بکرێتەوە لەرێگەی خولی تایبەت بۆ ئەوەی لەبەکارهێنانی ئەو جۆرە سایتانە دوور بکەونەوەو کاتی خۆیان بەفیڕۆ نەدەنو هەوڵ بدەن لەجیاتی ئەوە



سوود لە بوارێکی وەرزشی، مۆسیقی، هونەری، ئەدەبی، زانستی...هتد، وەربگرن.

★ئەگەر دوا پرسیارم لەسەر خۆسووتاندن بێت، پێتوایە خۆسوتاندن دەرئەنجامی چییە؟ چی وا لەژنان دەکات بیر لەم ڕێگایە بکەنەوە، پێتوایە ئەمە چارەسەرە یان ئەو پەری بێتواناییە..؟

-خۆسووتاندن ئەو تەقسە ئاینیەیە کەتەنها ژنانو ژنان دەتوانن، لەگەڵیدا هاوڕێ بنو پەنای بۆ بەرنو بەچارەسەری کێشەکانیانی بزانن، چونکە کەس تا ئێستا بیستویەتی پیاوێك بتوانێتو ئەوەندە بەجورئەت بێت خۆی بسوتێنێت، بێگومان نەخێر.

بەڵام دەبێت ئەوە باش بزانین کەخۆسووتاندنی ژنان دەرەنجامی ئەو هەموو کێشە کۆمەڵایەتیو چینایەتیو خێڵایەتیو دابو نەریتو کلتورە باوانەیە، کە زۆربەی خێزانو پیاوانی کورد تا ئێستا پەیڕەوی دەکەنو ژنان ناچار دەکەن کەپەنا بۆ خۆسووتاندن بەرن. دەکرێت ئەمەش دوو لێکدانەوەی بۆ بکرێت.

یەکەمیان: بەجورئەتیو ئازایەتیو لەخۆ بردووی ژنی کورد نیشان دەدات، کەدەتوانێت و بەجورئەتەوە دەستی

دەچێتە سوتاندنی لاشەی خۆی لەناو بردنی وەك لەوەی سەر بۆ کۆمەڵێك بڕیاری نابەجێ دابنەوێنێتو مل کەچی فەرمانەکانیان بێت، ئەمە خۆی لەخۆیدا لەرووە مەعرفیەکەیەوە، کەسایەتی بەهێزی ژنی کورد دەردەخات، کەخۆزگە دەخوازم چیدی پەنا بۆ سوتاندنی لاشەی خۆیان نەبەن، بەڵکو بەجورئەتەوە رووبەڕووی ئەو بڕیارە نەشیاوانە بوەستنەوەو چۆکیان پێ دابدەن، یاخود لایەنی لەیەك تێگەیشتن رێکەوتن لەسەر بنەمایەکی ئینسانی رێك بکەون.

دووەمیان: ژنی کورد لەئاستی هەندێك کێشەدا بەتایبەتیش کێشە گەورە خێزانیەکانی کەرووبەڕووی دەبێتەوەو هەست دەکات کۆمەڵگە سەرزەنشتی دەکاتو بەرەو کونجە تاریکەکانی دەبات، هەست بەتێکشکانو لاوازیو بێ چارەسەری دەکاتو هەموو خۆ رزگارکردنێکی خۆی لەسوتاندنی لاشەی خۆیدا دەبینێتەوە.بۆیە پەنا دەباتە بەر ئەم کارەو بەجارێك خۆشیو خێزانو کۆمەڵگەکەشی بەدەردی کێشەیەکی کۆمەڵایەتیەوە پەیوەست دەکات.

بەلام ئەوەی تێبینیم کردووەو ئەم خۆسووتاندنە بەزۆری تەنها لەناو ژنانی کورددا زۆر باوە، کەرەنگە



ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ تەقسێکی ئاینی یان کۆمەلایەتی کەهەر لەمنداڵییەوە کاریگەرییەکی سلبی لادروست کردوون وبەفریادرەسی خۆیانی دەزانن لەکاتی تەنگانەیەکی گەورەدا. بۆیە جارێکی تریش هیواخوازم کەژنانی کورد لەم کردەوەیە دوور بکەونەوەو بەورەیەکی بەرزەوە رووبەڕووی کێشەکانیان ببنەوەوچارەسەری گونجاوی بۆ بدۆزنەوە.

# دیداری ڤیان مەجید



٭دۆزی ژنـان لەجیهانـدا چۆن دەبینیـت بەگشتیو دۆزی ژنانی کورد لەچ ئاستێکدایە..؟

-قـسەکردن لەسـەر دۆزیـژن یـان ئـافرەت، مەودایـەکی بەرفراوان و تێڕوانینێکی قوڵی هەیە کە نـاتوانرێ بەیـەك پرسیار وەڵام بدرێتـەوە، چونکە مـن ئەگـەر بـاس لـە دۆزی ژن بکـەم لـە جیهـان دەبـێ بـاس لـە وڵاتـانی رۆژئـاوا و رۆژهەڵات، باس لـە ئـەفریقا و ئـەمریکا، بـاس لـە سروشـتی پێکهاتەی دۆزی ژن لە وڵاتـانی ئەسکەندەنافیا، لـە وڵاتـانی رەش پێـست و سـپی پێـست لـە وڵاتـانی ئیـسلام و مەسـیح و جولەکە، لـە وڵاتـانی رەگـەز ئـاری و رەگـەز سـامی و عیـبری و... هتد،بکەم و سروشت و نەریت و سـتراکتۆر و بونیـادی ئـەو وڵاتانـە هەڵتـەکێنم و لـەوێوە دۆزی ژن و مێـژوو و ئاکـام و ئێـستای بهێنمـەوە پـێش چـاو و پێـشبینی بـۆ ئایندەشی بکەم، بۆیە من لێرەدا بـە پێویـستی دەزانم خـۆم لە بەشـی یەکـەمی ئـەم پرسـیارە ببـوێرم و هەڵـسەنگاندنی خۆم بۆ دۆزی ژن لە جیهاندا نـەخەمە روو، بەڵام سـەبارەت بـە ئاسـتی ژنـی کـورد ئـەوا پێموایـە ئەگـەر بەچـاوێکی بەراوردکارییـەوە بڕوانینـە چاوگی ئاسـتی ژن لەکۆمـەڵگای کوردەواریدا دەبینین ئێستا بەر لەهەمووکاتێکی تر لەسـەر

ئاستی شکڵ لە لوتکەی پێشکەوتندایە بەچاو ساڵانی رابردووەوە، واتا لەڕووی شکڵیەوە دەبینین دەقاودەق لای ئێمە بڕیاری ٢٥٪ جێبەجێ کراوەو ئەوەتا(٤) ژن لەلایەنی سیاسی کۆمەڵگا وەزارەتیان لەدەستەو چەندین ڕێکخراوی (NGO) و حزبی تایبەت بەژنان هەن کە بنەماو پەیڕەویان بۆ کەم کردنەوەی نایەکسانی یەو پێشخستنی ژنان و کۆمەڵگایە، بەڵام لەڕووی جەوهەر و بابەتیەوە پێموایە دۆزی ژن زۆر مەوداو بوارماوە دەبێت بیبڕێت تاکوبگاتە ئەو ئاستەی شایستەیەتی و دیارە ئەمەش بەر لەهەموو شت بەستراوەتەوە بەکۆمەڵێ فاکتەرو پاڵنەرەوە کە هەریەکەیان رۆڵی کاریگەرو بنچینەیی لەسەر دۆزی ژن و پەیام و ئامانجەکەی ئەبینن و پێم وابێت ئەگەر ژن خاوەن پەروەردەیەکی تەندروست و ئابوریەکی سەربەخۆ و وشیاریەکی راستەقینە نەبێت مەحاڵە بوترێت دۆزی ژنی کورد یان هەر نەتەوەیەکی تر تەنانەت بوونیشی هەیە.

*پێتوایە لەکوردستاندا بزاوتێکی داکۆکیکەری تەواو لەمافەکانی ژنان هەبێت، یان سەرجەمیان لەژێر چاودێری حزبەکاندان..؟



-هەموو جار دەمەوێت خۆم ببوێرم لەباسکردنی ڕێکخراو، چونکە مادام ڕێکخراو لەئەنجامی بەریەککەوتنی کۆمەڵێك فیکرەی هاوشێوەوە دروست دەبێ کە ئامانجی سەرەکی تیایدا بەدی هێنانی ئەوفیکرانەو پێکاندنی ئامانجەکەیەتی، کەواتە ئاسایی‌یە نەمەوێت قسە لەسەر ئەم ڕێکخراوانەی ئێرە بکەم، چونکە کاتێك لێرە ڕێکخراو دروست دەبێت ئەوا هەژموونی حزبایەتی باڵی تەواو بەسەر کەسایەتی ڕێکخراوەکەدا دەکێشێ و ئیدی بواری مومارەسەی فیعلی پەیڕەو و پرۆگرامی ئەورێکخراوە نامێنێ ، لەڕاستیدا ڕێکخراو دەبێ گروپی فشارو هێزی بەرژەوەندی و لۆبی بێت لەنێو دەوڵەتدا نەك ببێتە ساقە سەری ئەو حزبەی دروستی کردووە. بۆیە کاتێك دەوترێ ڕێکخراوی ژنان دەبێ بەرژەوەندی ئەو ڕێکخراوە ئامانج و ئاکام و ستراتیژ و پەیامەکەی بۆ ژن بێ لەژن بێ و و هی ژن بێ، نەوەك کەسایەتی حزبی کاراکتەری سەرەکی نێو شانۆکەی بێ و هەرلەبەر ئەوەش ئەگەر سەیری ئەم وڵاتە بکەین تائێستا هیچ ڕێکخراوێکی سەرتاسەری لە کوردستاندا نەیتوانیوە کاربکات، ئەوەتا یەکێتی ژنان کە گەورەترین ڕێکخراوە تەنها لەسەر ئاستی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی(ی.ن.ك) کار ئەکات و یەکێتی ژنان

لەناوچەكانی(پ.د.ك) و.....تد، كەئەمەش جگە لە پەرتبونەوەی خواستە هەمیشەیی و خواستە یەكگرتووەكانی ژنان هیچ ئاكامێكی تری لێ ناكەوێتەوەو تەنانەت یەكانگیری و هاوبیروڕایی لەسەر مەسەلە هەنوكەیی‌یە-كانیش لەباردەبات. بۆ نمونە كاتێ نەسرین بەرواری شووبە غازی عجیلی سێ ژنە دەكات ئەوە بەفعلی كاری ڕێكخراوی یەكێتی ژنان و (ی.ژ.ك) و سەرجەمی ڕێكخراوەكانی ژنان بەیاننامەیەكی هاوبەشی سەرانسەری دەربكەن و تیایدا ناڕەزایی بدەنە دەست سەركردایەتی سیاسی كورد كە ئەوان ئەم حاڵەتە ڕەت دەكەنەوە كەچی بەداخەوە جگە لە(ی.ژ.ك) كە لەڕۆژنامەی ژیانەوەدا ئاماژەی پێدا، زۆرینەی ڕێكخراوەكانی تر مەسەلەكەیان كردە قوربانی پەیوەندی حزبایەتی و دیزە بەدەرخۆنەیان كرد.

بۆیە من پێم وایە هەتا ڕێكخراو خاوەن بڕیارو كەسایەتی و ڕێبازی سەربەخۆی خۆی نەبێ مەحاڵە بتوانێ بەڕاستی نوێنەرایەتی ئەو جەماوەرەبكات كە لەپێناویدا دامەزراوە.

⋆كەسێتی كوردی كەسێتییەكی نەگۆڕاوە، بەتایبەتی پیاو، كەپاش ئەم هەموو پێشكەوتنەی جیهان هێشتا



بەتۆمەتی شەرەفو شتی تر ژنان تیرۆر دەكرێن، ئەمەش تەنها لەكوردستان نییە، بەڵكو لەئەوروپاش ڕوویدا وەكو تیرۆركردنی (فادیمە)و چەندانی تر، پێتوایە هۆی نەگۆڕانی عەقڵی پیاوی كورد چییە؟ لەكاتێكدا ژینگەو كۆمەڵگاش گۆڕاوە..؟

-ئەمە پرسیارێكی تەواو سۆسیۆلۆژی و لەهەمان كاتدا پەیوەندیەكی قوڵی بەدنیای دەرونناسییەوە هەیە، چونكە كەسایەتی مرۆڤەكان هەمیشە دوو پێوەر تەحەكومیان پێوە دەكات، (١)ئەو كۆمەڵگایەی كەمرۆڤ تیایدا دەژی(٢) ئەوعەقڵیەتەی مرۆڤ خۆی خاوەنیەتی.

لێرەوە كێشەكە قوڵ دەبێتەوە، چونكە كۆمەڵگای ڕۆژهەڵات، نەك بە تەنها كۆمەڵگای كوردی، هەموویان كۆمەڵگای توندڕەو و دەمارگیرو نەژاد پەرستن بۆیە ئەسالەت و ڕەسەنایەتی و شەهامەت و پیاوەتی و خانەوادەیی و٠٠٠هتد، كۆمەڵێ چەمكی كۆمەڵایەتی تەواو حساب بۆ كراون وئەوان ئایندەی تاك و خێزان و كۆمەڵ دادەڕێژن.

كەواتە دەبێت ئێمە هەمیشە ئەو حەقیقەتە لە بەرچاو بگرین كە تا چەندێك وابەستەین بە كۆمەڵگا و خێزانەوە، تا چەندێك پەیوەندیەكی ڕۆحانی لە نێوان

خۆمان و ئەخلاقماندا هەیە، ئەخلاق لای ئێمە شتێکە لە مولامەسە و چاوبڕکێ و زەردەخەنە و سێکسدا خۆی دەبینێتەوە. ئەگەر کچێك یان کوڕێك ئەم ڕێسایەی شکاند شایستەی لێپرسینەوەیە، بۆیە هەردەم کوڕو کچی ئێمە لەبەردەم مەترسی تاواندان ئەو تاوانانەی کە کلتوری کۆمەلایەتی دایان ئەڕێژێ و ئەمەش خواستێك لە ناخیاندا دروست دەکات کە تامەزرۆی دەرچوون بن لە واقیع، تامەزرۆی پەناهندەیی و کۆچکردن و غوربەت بکەن،تۆ سەیری رابردووی نزیك بکە،چەندین کچ، کیژۆڵە، مێرد منداڵ، لاو، کۆچیانکردوو بەرەو هەندەران هەڵنوتن، ئەوان لە راستیدا حەز بە غوربەت ناکەن، بەڵام چارەی لێپرسینەوەشیان ناوێت، کەیفیان بە چاو لێ سورکردنەوە نایەت، حەز بە چارەی دڵپیسی و بوختان و درۆکردن ناکەن، ئەوان زۆربەیان وایاندەزانی لەوێ ئازاد دەبن، نەیانزانی پەروەردەکەیان بە شێوەیەکی سیستماتیکی بە دوایانەوەیە، من پێموایە کوشتنی (فادیمە) هێندە کارەساتێکی گەورە نەبوو وەك ئەوەی هەموو میدیاکان لەسەری هاتنە دەنگ بە بەراورد بەو کارەساتانەی کە بەهۆیەوە چەندین کچی ئەم ولاتە لە ترسی لێپرسینەوە، لە واقیع رایان کرد و هێندەش مەترسیدار نەبوو بە



قەدەر ئەوەی پیاوە پیرەکانی هەندەران دێن و بەهەمان عەقڵی عەشایەرییەوە کیژۆڵەیەکی (١٥-٢٠) ساڵان مارە دەکەن.

ئەزانی...کارەسات ئەوەیە روناکبیر و خەڵکە بڕوانامەدارەکەش بەم کارە هەڵدەستن نەوەك تەنها پارەدار و کەسە نەناسەکە.

*پێتوایە تەکنەلۆژیا تاچەند خزمەتی بەدۆزی ژنان کردووە، لەکاتێکدا لەرێی کەناڵو سایتە سێکسیەکانەوە قێزەونترین دیمەنی ژنان بلاودەکرێتەوە..؟

هەموو شتێك لایەنی پۆزەتیف ونێگەتیڤی هەیە، رەنگە مەسەلەی تەکنەلۆژیا، دۆزی ژنانی ناوچە دوورە دەستەکانی نزیك کردبێتەوە و کۆنتاك و پەیوەندیە ئەلیکترۆنیەکان زۆر مەوداو پارەی بۆ ژنان گێڕابێتەوە. جاران بۆ ئەوەی پەیوەندیەك بە یەکێ لە ژنە ناودارەکانی بۆ نمونە لە رۆژهەلاتی کوردستانی بکرایە، دەبوو بە نامەیەکی نهێنی بدرایەتە دەست کاروانچیەك و (٢-٣)هەفتە چاوەڕوانی بوینایە تا وەلامی دەدایەوە، بەلام ئێستا تۆڕەکانی ئینتەرنێت ئەم کارە بە (١٠) خولەك ئەنجام دەدەن، هەڵبەت ئەوەی ئێوەش دەیڵێن وایە سەتەلایت و هۆکارەکانیتری عەولەمە و تۆڕەکانی

تەکنەلۆژیا زیانی باشی لەلاکەی ترەوە بە ژنان گەیاندووە، من پێموایە عەولەمە چینی سەرمایەدار و خاوەن نفوز سودی باشی لێ دەبینێ جا پیاو بێ یان ژن، بەڵام خەڵکە رەشوروتەکەش دەبنە سوتماکی ئەو پرۆسە جیهانگیریە و ئاشکراشە ژن هەمیشە لە نێوەندی چینە نەدارەکەدایە ئەمە سەرباری ئەوەی بۆ خۆی کەرەسەیەکی جوانکاری ئەو کەناڵ و سایتانەیە، بڕوانە بۆ نمونەی گۆرانی (البرتوقالە)، یان روبی گۆرانیبێژی میسری یان لوسی یان...هتد، ئەمانە کێ پێیان دەڵێ ئەم کارە بکەن، کێ پێیان دەڵێ ئاوها جوانی لەش و لاریان پەخش بکەن؟ کێ پێیان دەڵێ ئەوەندە شەهوەتبازانە یاری بە زمان و چاو و لەش و لاریان بکەن؟

لە راستیدا ئەلیساو نانسی عەجرەمیش خۆیان پەخش دەکەن، بەڵام ئەمەی ئەمانە زۆر جیاوازە لەوەی روبی و لوسی، لانی کەم هەست دەکەین ئەم دووەی دواین دەیانەوێ پەیامێکی هونەری بگەیەنن، بەڵام ئەوانی دی گروپێکی پارە پەیداکردنن و نەهامەتیەکەش لەوەدایە ئەوانەی بە کاری وێنەگرتن هەڵدەستن زۆر بێ شەرمانە زوومی کامێراکانیان دەخەنە سەر سنگ و سمت و شوێنە هەستیارەکانی تری ئەو کچە شۆخانەی وەك بووکە شوشە



سەما دەکەن، ئەمەش بە رای من ئازادی نییە، بەڵکو سەر لەنوێ بە کەنیزەك کردن و بە کۆیلەکردنی ژنانە بە جۆرێکی تر کە ئەمجارەیان ژن خۆی بە کەسایەتیەکی ماسۆشیانە رۆڵ دەبینێ.

*ئەگەر دوا پرسیارم لەسەر خۆسووتاندن بێت، پێتوایە خۆسوتاندن دەرئەنجامی چییە؟ چی وا لەژنان دەکات بیر لەم رێگایە بکەنەوە، پێتوایە ئەمە چارەسەرە یان ئەو پەری بێتواناییە..؟

-ئەو دەمەی مرۆڤ هەست دەکات هیچ چێژێك لە ژیان نابینێت، ئەو دەمە دەگاتە ئەو بڕوایەی مردن دوا چارەسەرەو ئەم دەتوانێ لانی کەم ئەگەر خۆشی ژیانی بۆ نەگێرێتەوە، لە ناخۆشی ژیان رزگار بکات. بۆیە زەحمەتە تاکێك کە ئاوها بیر بکاتەوە، بتوانێ کۆنترۆڵی خواستی خۆ رزگارکردنی بکات و تەحەکومێکی عەقلانیانە بەسەر ئەو خواستەدا بکات. هەڵبەت لە کۆمەڵگای ئێمەدا خۆسوتاندن، یان خۆکوشتن هەمیشە دەرئەنجامی بەکارهێنانی فشار و زۆرلێکردن و پەستان خستنەسەرە بە شێوەیەك ئەو فشار و پەستانانە کاریگەریەکی زۆر بریندارکەر لە دەروونی ئەو کەسەدا جێدەهێڵێ تا ئەو

رادەیەی بۆ ئەوەی ئارامی بداتە خۆی، بڕیاری خۆسوتاندن دەدات.

من بەش بە حاڵی خۆم پێموایە زۆرینەی خۆسوتاندنەكان پیاوێكی لە پشتەوەیە، لە كاتێكدا، دەزانم ئەم قسەیەم قابیلی قبوڵكردن نییە، چونكە بۆ خۆی فەلسەفەی خۆسوتاندن لای من زۆر نەفام و بێ مێشكیانەیە، بەڵام ناكرێت ئەو راستیە نەوترێت كە پیاو كاراكتەری مەسەلەی خۆسوتاندنە لای ژن، جا ئەو پیاوە مێرد، یان باوك، یان برا بێت كە سلبیانە كاریگەری بخەنە سەر و بیانەوێ كارێك بەو ژنە بكەن كە ئەو نەیەوێت بیكات.

بۆیە من پێموایە هەر ژنێك دەمرێت پیاوەكەی خۆش بێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەمجارەش دەیڵێمەوە مەسەلەی خۆسوتاندن كارێكی یەكجار نامرۆڤانەیە و دەرئەنجامەكەشی زۆربەی كات بە نێگەتیف بەسەر ژنە سوتاوەكەدا دەشكێتەوە بۆیە ژن ئەگەر بە دوای چارەسەردا بگەڕێت، چاكترە خۆی نەكوژێت، یان خۆی نەسوتێنێت و رێگایەكی تر بگرێتە بەر بۆ دەربازبوون لەو كۆتو بەندانەی لەسەریەتی، هیچ نەبێ پەیوەندی بكات بە یەكێك لەو سەنتەرانەی ژنان دەپارێزن و



پارێزگاری لە كەرامەتیان دەكەن، چونكە لە دواجاردا خۆسوتاندنی هەر ژنێك پەڵەیەكی بەد رەوشتی بۆ ئەو ژنە دەهێنێ و هەمووشمان ئەزانین هەموو خۆسوتاندنەكان پەیوەندیان بەڕەوشتەوە نیه‌یە!!

# دیداری سەرگوڵ قەرەداغی



★دۆزی ژنان لە جیهاندا چۆن دەبینیت بەگشتی و دۆزی ژنانی کورد لە چ ئاستێکدایە..؟

-دۆزی ژنان لە جیهاندا ئێستا کە لە هەزارەی سێیەمداین و جیهان هەنگاوی گەورەی ناوە لە گشت بوارەکاندا، بەڵام دۆزی ژنان نەچۆتە پێشەوە و هێشتا لە پەراوێزدایە و نەبۆتە کێشەیەکی سەرەکی و هەوڵی جددی بۆ نەدراوە، لە واقیعدا بارودۆخی ژنان لە رۆژئاوا ئەگەر سەرنجی بدەین زۆر ناهەموارە لە زۆربەی وڵاتانی رۆژئاوادا، تائێستاش کرێی کاری ئافرەت بەرامبەر پیاوان نییە، زۆربەی ئامارەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ژنان قوربانی دەستی توندوتیژی خێزانی و خاوەن کارن تائێستاش لەزۆربەی وڵاتانی رۆژئاوای بەناو پێشکەوتوو ژنان نەگەیشتونەتە ناوەندەکانی بڕیار و دەسەڵات، کێشەی ژنان لە رۆژهەڵات زۆر ناهەموار ترە لە ژنانی رۆژئاوا تا ئێستا ژنان دەناڵێنن بەدەست کێشە کۆمەڵایەتییەکانەوە و بەرزی رێژەی نەخوێندەواری و هەروەها بێبەشبوونیان لە ناوەندەکانی بڕیار و دەسەڵات بەنیسبەت دۆزی ئافرەتی کورد کە ئەویش دابڕاو نییە لە دۆزی کورد، خۆی کە لەدوای راپەڕینەوە جۆرێك لە بەجیهان ناساندنی کێشەی کورد و گەلی کورد رویدا کە ئەویش بووە هۆی

کرانەوەی جیهان بە رووی کورد و کێشەکەیدا کە دواتر کاریگەری هەبوو لەسەر دۆزی ئافرەتی کورد، بەڵام بەپێی تایبەتمەندی کوردستان و دروست بوونی فرە حزبی کە بێگومان ئافرەتیش وەك تاکێکی ئەم کۆمەڵگایە بوون بە ئەندامی ئەو حزبانە لەڕێی رێکخراوەکانی ژنانەوە کە ئەمە بووە هۆی ئەوەی ئەو رێکخراوانەی کە سەر بە حزبی دەسەڵاتدار بوون کە تەنها لەسەر ئاستی کۆمەڵێك ئافرەتی نوخبە بوو، بەڵام لەسەر ئاستی گشتی تائێستاش کۆمەڵێك گرفت و کێشەی کۆمەڵایەتی هەیە کە ئافرەتی کورد پێوەی دەناڵێت، هەروەها کۆمەڵێك کێشە و گرفتی نوێ کە لەدایك بووی قۆناغی دوای راپەڕین بۆ ژنان دروست بووە لە کۆچ کردنی لاوان بۆ هەندەران و دیاردەی لەشفرۆشی و بەرزبوونەوەی رێژەی خۆسوتاندن کە پێویستی بە کەسانی خەمخۆر هەیە بۆ لێکدانەوەیان.

*پێتوایە لە کوردستاندا بزاوتێکی داکۆکیکەری تەواو لە مافەکانی ژنان هەبێت، ئایا سەرجەمیان لەژێر چاودێری حزبەکاندان..؟

-بزوتنەوەی ژنان لە کوردستاندا بە رای من بزوتنەوەیەکی داکۆکیکەری تەواو نییەلە مافەکانی ژنان، چونکە رێکخراوەکانی ژنان هەریەکەیان پاشکۆی حزبێکن



بەپێی بیروبۆچوون و ئایدیای ئەو حزبە داکۆکی لە مافەکانی ژنان دەکەن، واتە ئەگەر ئافرەتێك مافی بخورێت و ستەمی لێبکرێت فلان رێکخراوی ژنان ئامادە نییە داکۆکی لێبکات، چونکە ئایدیای ئەو ئافرەتە ناگونجێت لەگەڵ ئایدیای ئەو رێکخراوەدا، یان سەر بە رێکخراوێکە دژی بیروبۆچوونی ئەوە، واتە حیساب بۆ کەسێتی ئافرەتەکە ناکرێت.

*بەرای بەڕێزت رێکخراوەکانی ژنان توانیویانە بەدیهێنەری مافەکانی ژنان بن، ئایا تا چەند لەم ئەرکەدا سەرکەوتوو بوون..؟

-پێموایە ئەم پرسیارە لەگەڵ پرسیاری پێشوودا زۆر جیاوازی نییە، چونکە ئەگەر رێکخراوەکانی ژنان داکۆکیکەری تەواو نەبن لە مافەکانی ئافرەت چۆن دەتوانن مافیان بۆ بەدیبهێنن! رێکخراوەکانی ژنان خۆیان بە شتی لاوەکیەوە خەریك کردووە، وەك تەنها لێدوان و قسەکردن و کۆڕ و سیمینار، بەڵام بواری پراکتیکی عەمەلی کەم ئیشی بۆ کراوە، لەم ساڵانەی دوایدا زۆربەی هەوڵی رێکخراوەکان بۆ گۆڕینی یاسای ئەحوالی شەخصی عێراقی بوو، کە دوا هەوڵیان بڕیاری (٦٢) بوو تایبەت بە تەعدیلی چەند بڕگە و مادەیەکی ئەو یاسایە، بەڵام

لەدوای ئەوەی چووە بواری عەمەلیەوە دەرکەوت ئەو بڕیارە نەك مافی بۆ ژنان بەدی نەهێناوە، بەڵکو چەند مافێکی لێ سەندونەتەوە کە لێرەدا بواری باسکردنی ئەو بڕیارە نییە.

*کەسێتی کوردی کەسێتییەکی نەگۆڕاوە، بەتایبەتی پیاو، کە پاش ئەم هەموو پێشکەوتنەی جیهان هێشتا بە تۆمەتی شەرەف و شتی تر ژنان تیرۆر دەکرێن، ئەمەش تەنها لە کوردستان نییە، بەڵکو لە ئەورووپاش روویداوە وەکو تیرۆرکردنی (فادیمە) و چەندانی تر، پێتوایە هۆی نەگۆڕانی عەقڵی پیاوی کورد چییە؟ لە کاتێکدا ژینگە و کۆمەڵگاش گۆڕاوە..؟

-هۆکاری نەگۆڕانی عەقڵی پیاوی کورد چییە؟ بەنیسبەت ئەم پرسیارەوە ئەوەی شتێکی روون و ئاشکرابێت پیاوی رۆژهەلات بەگشتی و پیاوی کورد بە تایبەتی لەسەر جۆرە نەریت و شێوازێك پەروەردەکراون لە منداڵیەوە کە کاریگەری بۆسەر کەسێتیان هەیە لە گەورەییدا بۆتە بەشێك لە بوون و تێکەڵ بە عەقڵ و هۆشیان بووە کاتێك دەچێتە هەندەران بێگومان هەر بەو عەقڵیەتەوە دەچێت کە لەسەری پەروەردە بووە و مامەڵەی پێکردووە، بەڵام واقیعی ژیانی هەندەران زۆر جیاوازە لەگەڵ واقعی ژیانی



کورددا لەڕووی کەلتوور و زمان و شێوازی هەڵس و کەوت کە بێگومان نامۆیە بە داب و نەریتی ئایینی کۆمەڵگای کوردی، بەڵام ئەو تاوانەی ئەکرێت بەرامبەر ئافرەت بە (تۆمەتی شەرەف) کە زۆرجار بێئاگایانە دەدرێتە پاڵ ئایین ئەگەر بە چاوێکی ئینسانیەوە سەیری بکەین دوورە لە پاکی ئایینی ئیسلام کە لەکاتی حاڵەتی لەو جۆرەدا داوای لێکۆڵینەوە و دڵنیا بوون دەکات و بوونی ژمارەیەك شایەد لەسەر ئەو حاڵەتە دواتر یەکلاییکردنەوەی کێشەکە لەبەردەم دادگا، نەك تاکەکان خۆیان ئەم کارە ئەنجام بدەن.

*پێتوایە تەکنەلۆژیا تاچەند خزمەتی بە دۆزی ژنان کردووە، لەکاتێکدا لەڕێی کەناڵ و سایتە سێکسیەکانەوە قێزەونترین دیمەنی ژنان بلاودەکرێتەوە..؟

-بێگومان پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا خزمەتێکی گەورەی بەسەرجەم مرۆڤایەتی کردووە بەگشتی و ژنان بە تایبەتی، بەڵام ژمارەیەك لە کۆمپانیا و کەناڵە بازرگانیەکان تەنها مەبەستیان بەرژەوەندی و لایەنی مادی خۆیانە وە ئافرەتیان کردووە بە کاڵایەك بۆ رەواج پێدانی کەناڵەکانیان کە ئەوپەڕی سوکایەتییە بەرامبەر

کەسێتی ژنان کە بە قێزەونترین دیمەن وێنەی ژنان بڵاو دەکەنەوە.

★ئەگەر دوا پرسیارم لەسەر خۆسوتاندن بێت، پێتوایە خۆسوتاندن دەرئەنجامی چیە؟ چی وا لە ئافرەت دەکات بیر لەم ڕێگایە بکەنەوە، پێتوایە ئەمە چارەسەرە یان ئەوپەڕی بێتواناییە..؟

-خۆسوتاندن دەرئەنجامی بێهیوایی و داڕوخانی کەسێتی ئافرەتە کە ڕێژەکەی زۆر زیادی کردووە لە کۆمەڵگاکەماندا کە پێویستە هەڵوەستەی لەسەر بکەین و هەوڵی دۆزینەوەی ڕێگا چارەی گونجاو بدرێت، هۆکارەکانی زۆرجار لە کێشە کۆمەلایەتیەکانەوە سەرچاوە دەگرێت، لەهیچ کاتێکدا نابێتە چارەسەر بۆ کێشەکان تەنها دەلالەت لە بێتوانایی و بێئارامی و نەمانی هیوا دەکات.

# بەشی دووەم

# ژن و تێڕوانینەکان

ئەم وتارانەی لەم بەشەدا بڵاوکراونەتەوە زۆرێکیان لە ڕۆژنامەکاندا بڵاوکراونەتەوە و لەبەر پەرش و بڵاویان کۆکردنەوەیانم بە پێویستزانی



## قسەیەك لە (٨)ی مارس-دا

هەموو ساڵێك (٨)ی مارس ڕۆژی ژنانی جیهانە، کە تێیدا ژنان دەنگی ناڕەزاییان بەرامبەر دەسەڵاتی پیاوسالاری و چەوساندنەوە بەرزکردەوە، ئەویش کە ژنانی یەکێك لە کارگەکانی چنینی شاری (نیۆرك)ی ئەمریکا دەستیان بە مانگرتن کرد و ناڕەزاییان دەربڕی لە بارەی چوونە سەری کرێ و هەقدەسی کار وهەقی بیمەی بێکاری و کەمکردنەوەی کاتی کارکردن.وەلێ پاشان بە ئاگرتێبەردانی کارگەکە وەڵام درانەوە و لە ئەنجامدا (١٢٩) ژن لەو ژنە شۆڕشگێڕانە گیانیان سپارد لە پێناوی مافە سروشتییەکانی خۆیاندا قوربانیاندا و لەو ڕۆژەوە بەردەوام تا هەنووکەش سەرجەم ژنانی جیهان یادی ئەم ڕۆژە دەکەنەوە و بە جەژنی ژنانی ناو دەبەن.

دیارە ئازادی ژن بریتی نییە لە ئازادی لە سنورێکی دیاریکراودا، بەڵکو بریتیە لە مومارەسەی کۆمەڵایەتیانەی ئازادی لەلایەن تاکەکانەوە و دەبێ زەمینەی پتەوی

پەروەردەیی و ئابووری  وشیاری کۆمەڵایەتی هەبێت بۆ ئەو پرۆسەیە، چونکە پێموایە بە بێ هەر یەکێك لەو فاکتەرانەی سەرەوە ئەم مافە بە ژن رەوا نابینرێ. هەروەها ئازادی ژن بەبێ ئازادی تاك سەرناگرێ، دەبێ دەسەڵاتی پیاو کە بە یاسا لەسەر ژن لادەبرێ بگۆڕدرێت بۆ سەربەستیەکی راستەقینەی مرۆیی کە مێیینە مومارەسەی بکات. بۆیە لە ناوبردنی عەقڵیەتی دۆگما وسەلەفی ئەرکی یەکەمە تا سنوری ئازادی مێیینە فراوانتر بێت و دەروازەیەکی نوێی بەرووی مافەکانیاندا بکرێتەوە.

ئەمڕۆ لە ژیانی تاکدا رۆژبەرۆژ مەودای دیموکراسیەت لە زۆر شوێنی دنیادا بەرەو فراوانتر هەنگاو دەنێت و ئەم فراوان بوونەش فاکتەری باش بووە بۆ کارکردن و بەردەوامی ژنان بۆ چنگ کەوتنی ئازادی و بەدیهێنانی مافە زەوتکراوەکانیان و رێگە گرتن لە کردەی تیرۆری کچان وژنان وسەر نگومکردنیان، هەروەها دەبێ ژنانی قوربانیدەر لە خۆبووردووی نێو بزوتنەوەکانی ژنان کاری جددی بکەن بۆ سڕینەوەی ئاسەواری گشت زوڵم و ستەمەکانی سەر ژنان.



(٨)ی مارسی ئەمساڵ کە پاش یەکەمین هەڵبژاردنی دیموکراسی دێت لە عیراقدا لە هەموو روویەکەوە جیاوازە لە ساڵانی رابردوو، ئەمساڵ خەباتی ژنان پێیناوەتە قۆناغێکی هەستیارەوە ، کە من بە قۆناغی بەربەرەکانێ و گفتوگۆی ناودەنێم بۆ دەست خستنی مافەکانی ژنان. بۆیە دەبێ سەرجەم رێکخراوەکانی ژنان بەیەك دەنگ بڕیار لەسەر هەر مەسەلەیەك بدەن کە سودمەندە بۆ دۆزی ئەوان و هەر بڕیارێکیش رەت بکەنەوە کە دژی مافەکانیان دەوەستێت، هەروەها دەکرێت پیاوانی ئازادیخوازیش یارمەتیدەری ژنان بن لەبەدەستهێنانی مافەکانیان،چونکە ژنی ئازاد وهاوچەرخ ورۆشنبیر نەك بۆ پیاوان سەر شکان نییە، بەڵکو هێزی راستەقینەی ئازادی پیاوانیش دەبێ و هەردوو رەگەز پێکەوە لە یەکسانیاندا هاوسەنگیەك دەدەن بە ژیان وبەرگێکی رازاوەتری بە باڵا دەپۆشن و ژیانێکی ئاسودەتر دێتەبوون.

دواجار با (٨)ی مارس رۆژی لە ناوبردنی چەوساندنەوەی مێینە و بنەبڕکردنی دیاردەی تیرۆر و سەرنگومکردنی ژنان بێت و ببێتە زەمینەیەکی لە بار بۆ بەرهەمهێنانی تاکی ئازاد لە فەزای دیموکراسی و کۆمەڵی مەدەنیدا و ژنانیش پاش لە ناو چوونی رژێمی بەعس بە

مافه سروشتییه رەواكانی خۆیان بگەن و له دەستووری هەمیشەیشدا سەرجەم مافەكان بەرجەستە بكرێن، هەروەها وەكو چینێكی دیاری كۆمەڵگە پەرە بە ئەفراندن و توانا و وزە شاراوەكانی خۆیان بدەن و تا بوونیان له كۆمەڵگەدا بەسەنگێكی قورسەوە بسەلمێ.

٢٠٠٥/٣/٦



# شكسپیر و ژن

نوسین وەكو پرۆسەیەكی داهێنان بەدەر نییە لە كارتێكردەكانی ئەو كۆمەڵگەیەی كە نوویەر تێیدا دەژی و لەهەمانكاتدا ئەگەر نووسەر ئاگاداری دەورووبەر و وڵاتانی جیهان بێت ئەو كاریگەریانە رەنگدانەوەی هەمەلایەنتری دەبێت هەر لێرەشەوە دەكرێت بڵێین كە روانینی نووسەر بۆ دیاردەكان و شتەكان بەدەر لەوەی لە ژێر كاریگەری بیركردنەوەی نوسەردایە، بەڵكو دەوروبەریش كاریگەری لە پرۆسەی خولقاندنی نوسیندا هەیە. ئاشكرایە كە نوسەران تەنها لە رێی نوسینەوە گوزارشت لە هەموو بووەكانی كۆمەڵگە بكەن و یەكێك لەو بوارانەشی كە زۆرترین قسەی لەسەركراوە "ژن"ە وەكو هاوبەشێكی ژیانی مرۆڤ.

سەرەتا دەمەوێ بە قسەیەكی جۆن میلتۆن دەست پێبكەم كە دەڵێت؛ ژن جوانترین دیاری ئاسمانە. واتە لەگەڵ ئەو هەموو دیاریەی خودا بۆ ژیان بەخشیویەتی بە مرۆڤ، جوانترینیان ژنە، بێگومان ئەم وتەیەش لەگەڵ

روانینی یەکێك لە گەورە نوسەرانی دنیادا کۆکە کە ئەویش(شکسپیر) ە. ئەم نوسەرە وەکو زۆرێك لە نوسەرانی تر روانینی گونجاو و پۆزەتیڤی هەیە لەسەر ژن و ئەم روانینانەشی لە زۆرێك لە شانۆکانیدا رونکردۆتەوە لەوانە لە (هاملێت، رۆمیۆ و جولێت، شالیر)دا بە تایبەتیش لە(رۆمیۆ و جولێت)دا کە هەردوو پاڵەوانی شانۆکە لە پێناوی عەشقی یەکتردا مەرگ هەڵدەبژێرن و ئەمەش دەتوانین وەکو جوانترین تەوزیفکردنی یەکسانی نێوان هەردوو رەگەز سەیربکەین، کە ئەمەش جوانترین و درەوشاوەترین خاڵی نوسینە لای شکسپیر.ئەگەر لێرەوە سەرنج لەبوونی یەکسانی بدەین، دەبینین ئەم نووسەرە وەکو داکۆکیکەرێکی مرۆڤ و پاشان ژن هیچ جیاوازیەکی لە نێوان ئەم دوو رەگەزەدا ناهێڵێتەوە، چونکە پێموایە تاکە ئەرکی پرۆسەی نووسین ئەوەیە کە لە خزمەتی مرۆڤایەتیدا بێت و کاتێکیش نووسین ئەم بەها گرنگەی لە دەستدا لە تیرۆری فیکری و رۆحی ئینسان هیچ خزمەتێکی تر ناکات.

میهرەبانی ژن یەکێکی ترە لەو پایانەی بۆتە بناغەی فیکری شکسپیر و ئەو جوانی ژنی بەلاوە گرنگ نییە، بەڵکو میهرەبانی بەلاوە گرنگە، چونکە جوانی لای



شکسپیر میوانێکە و هەموو مرۆڤێك سەردەمێك ئەو میوانە لە روخساریدا دەبێت، بەڵام ئەوەی جەوهەرییە و میوانێکی هەمیشەییە لە دڵ و دەروون و روخساریمرۆڤە "میهرەبانی"یە، بۆیە پێی وایە ژنی میهرەبان باشترین دیاری خودایە، لەلایەکی ترەوە دەڵێت؛ ئەی ژن تۆ ئەوەیت کە خوازیارم هەرچی هەمە و نیمە بیخەمە ژێر پێتەوە. لێرەشدا دیسان ژن وەکو کائینێکی کاراتر و پڕ بایەختر دەبینێت و ئەو بەشایەنی یان خاوەنی هەموو شتەکانی ژیانی پیاو دەزانێت، کەواتە شکسپیریش دەیەوێت وەکو بەلزاك بڵێت؛ ماڵیبێ ژن گۆڕستانە. واتە ئەوە ژنە رۆحی پیاو بە ژیاندۆستی ئاشنا دەکات و ناهێڵێت ماڵ و لانەی ژیانی لێ ببێتە گۆڕستان.

دواجار دەتوانین بڵێین ژن لای شکسپیر هەڵگری بەهایەکی تایبەتی ژیاندۆستی و خۆ فیداکاریە، ئەمەش لە سەرجەم بەرهەمە شانۆیی و سۆنێتە شیعریەکانیدا رەنگدانەوەی بەرچاوی هەیە و لە هەمان کاتیشدا دەنگێکی نەرێی گەورەیە دژی چەوسانەوەی ژن لەلایەن ئایین و کۆمەڵگەوە.

شوباتی ٢٠٠٥

# ڤۆڵتێر و ژن

ڤۆڵتێر بیریار و رۆشنگەری فەرەنسی و یەکێك لەو نوسەرانەی دەتوانین بە داکۆکیکەری مافەکانی ژنانی لەقەڵەم بدەین، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا لە هەندێك نوسینیدا چەند رایەکی جیا یان پێچەوانەی داکۆکیکردنەکانیەتی لە ژن، ئەوەی گرنگە قسەی لەسەر بکەین پێگەی ژنە لای ڤۆڵتێر و ئەو هۆکارەی بووەتە هۆی ئەم دووفاقی‌یە.

ڤۆڵتێر ژن وەکو پێویستی‌یەکی گرنگ دەبینێت لە ژیانی پیاودا و پێیوایە تەنها ژن دەتوانێ ئەو بۆشاییە بۆ پیاو پڕبکاتەوە کاتێك دەبێتە هاوسەری ژیانی، یان زیاتر رۆدەچێت و دەڵێت؛ خۆشەویستی ژنێك بۆ مێردەکی شیرینترین شتە لە ژیاندا. ئەم هەڵوێستانە لە چەندین کتێبدا دووپاتکردۆتەوە و تا دەگاتە ئەوەی کە خۆشەویستی ژن لەسەرووی هەموو زانست و بەهرەیەکی پیاوەوەیە وەکو خۆی دەڵێت؛ هەموو ئەو زانست و بیرەی کە پیاو هەیەتی نرخی خۆشەویستی ژنی نییە. واتە ئەوە



خۆشەویستی‌یە کە هەموو شتێك بۆ ژیانی مرۆڤ فەراهەم دەکات و هاوکێشەی لاسەنگی ژیانی پیاو هاوسەنگ دەکات، یان بە مانایەکی تر قسەکردنە لەسەر چەمکی یەکسانی هەردوو رەگەز، کە پێموایە لێرەدا ڤۆڵتێر زۆر جوان تەوزیفی کردووە، چونکە ئەم بیرمەندە ژیان وادەبینێت کە بەبێ ژن هاوسەنگی‌یەکەی لەدەست دەدات.

لەلایەکی ترەوە ڤۆڵتێر چەند رایەکی جیاوازی لەسەر ژن هەیە و ژن وەکو شومترین بونەوەری ناوزەد دەکات، بێگومان ئەم ناکامیە لەو رایەوە سەرچاوەی گرتووە کە ژن وەکو کائینێك خاوەنی تایبەتمەندی و روانینی خۆیەتی بۆ ژیان و بوون، چونکە سروشتی مرۆڤ ئاڵۆزیەکی زۆری تێدایە و لە نێو ئەم ئاڵۆزیەشدا بەشێکی زیاتر بەر رەگەزی مێینە دەکەوێت و کە ئەمەش دەبێتە هۆی دروستکردنی سیفاتی تایبەتمەند کە رەنگە زۆرجار پێچەوانەی رای رەگەزی بەرامبەر بێت، هەر بۆیە لە شوێنێکدا دەڵێت؛ ژن سەرتاپای مەتەڵە، تەنیا منداڵبوون دەتوانێت پەی بەو مەتەڵە ببات. دیسان لێرەشدا ڤۆڵتێر دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ژن بونەوەرێکی ئاڵۆزە(کە ئەو بە مەتەڵ ناوی دەبات و مەبەست لە مەتەڵیش بوونی

ئالۆزیەکەیەتی) و ئەو ئالۆزیەیە کە تێگەیشتن لە بیر و ئەندێشەی ژن بە سانایی ناهێڵێتەوە.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو رایانەشدا وەکو سەرەتا ئاماژەم پێدا ژن لای ڤۆلتێر خاوەنی پێگەی تایبەت و یەکسانە لە ماف و ژیاندا، بەڵام پێکهاتەی فیسیۆلۆژی وا دەکات تێگەیشتن لە ژن و گۆڕانکاریەکانی سروشتی وەکو بونەوەرێك بەرەو روانین و تێگەیشتنی نادروستمان بەرێت.

مارسی ٢٠٠٥



# لامارتین و ژن

ژن تاکە بوونەوەری سەرزەوییە کەهەڵگری زۆرترین تەفسیرەو زۆرجاریش تەفسیرەکان بەهەڵە بۆ ژن کراون، چونکە وەکو لەچەند نوسینێکی تریشدا ئاماژەم بۆ کردووە ژن تاکە بوونەوەرە کە دەتوانێت بەچەندین سیمای جۆراوجۆر خۆی پیشانی رەگەزی بەرامبەر بدات و تاسەرنجی رابکێشێت و ئەم سەرنج راکێشانەش چ بەلایەنی پۆزەتیف،یان نێگەتیف لە هەردوو بارەکەدا رەگەزی بەرامبەر سەرسام دەکەن و زۆرجار ئەم سەرسام بوونەش بووەتە هۆی ئەوەی زاناو فەیلەسوف و نوسەرەکان بەدرێژای تەمەنیان لەسەر هەمان رای یەکەمجار نەبن، یان لەگەڵ بەساڵاچوون و هەڵکشانی تەمەندا رای جۆراو جۆریان لەسەر ژن هەبووە هەندێکجاریش چەندین رای دژیەکیشیان خستۆتەروو.

دیارە ئەگەر وردتر لەم بۆچوونە بڕوانین ئەوا دەبێ باروودۆخی دەروونی نوسەر و ژینگە و کۆمەڵگە لەبەرچاو بگرین، هەروەها ئەو سەدەیەش کە ئەو نوسەرە، یان

بیرمەندەی تێدا ژیاوە، چونکە کۆمەڵناسان هەموویان لەسەر ئەو رایە کۆکن کە کۆمەڵگە کاریگەرییەکی راستەوخۆی لەسەر بیرکردنەوەی نوسەر دەبێت، لەهەمانکاتیشدا کەسانی دەورووبەریش بەتایبەت کە زۆر لە نوسەرەوە نزیکبن لەو کاریگەریانە بەدەرنین، بۆیە کاتێك قسە لەسەر چەمکێك، یان بۆچوونێك دەکەین لای نوسەرێك دەبێت رەچاوی ئەو خاڵانەی سەرەوە بکەین.

شاعیری گەورەی سەدەی نۆزدەی فەرەنسا(لامارتین) یەکێکە لەو شاعیرانەی بۆ چوونێکی دووفاقی هەر لەسەر ژن هەیە و ئەو پێیوایە ژن کاملترین دروستکراوی خودایە. واتە ئەوە ژنانن لە پیاوانیش کاملترن و توانای هەموو کارێکی گرنگیان هەیە، یان وەکو خۆی دەڵێت؛ لەسەرەتای هەموو کارێکی گرنگدا ژن هەیە. بێگومان ئەم رایانە رای پۆزەتیڤن لەسەر ژن، ئەم نوسەرە ساڵانێکی زۆر لەسەر ئەم رایانەی بەردەوام بوو، بەڵام هەر لامارتین رای دژی راکانی سەرەوەی خۆیشی هەیە و دەڵێت؛ سەرەتای هەموو خراپەکاریەك دەستی ژنی تێدایە. بێگومان ئەم رایە لەو عەقڵە ئەفلاتۆنیەوە سەرچاوە دەگرێ کە دەڵێ؛ سوپاسی خواوەند دەکەم کە حەوت تایبەتمەندی پێبەخشیوم یەکەمیان ئەوەیە کە ئازادانە



هاتومەتە دنیاوە، دووەمیشیان ئەوەیە کە پیاوبووم نەك ژن. بیرکردنەوە لە پیاوبوون لای ئەفلاتون بیرکردنەوەیە لەباڵادەستی و نێرسالاری،کەلای لامارتینیش رەنگدانەوەی بەرچاوی هەبووە،لەم بۆچوونە دژەشدا لامارتین سوودێکی زۆری لەو قسەیەی ئەفلاتون وەرگرتووە. بۆیە لێرەدا دەگەینە ئەورایەی عەقڵی نێر سالاری نەك ریشەیەکی کۆنی لەنێو ئاییندا هەبووە، بەڵکو ریشەیەکی کۆنیشی لەنێو هزری رۆشنبیران و بیرمەندیشدا هەبووەو هەیە، چونکە دواجار ئەوانیش لە کاریگەری ئایین و کۆمەڵگە و...هتد بەدەر نەبوون. بێگومان تەنها لامارتین خاوەنی بۆچوونی دووفاق نییە، بەڵکو دەیان نوسەر و بیرمەندیتر خاوەنی هەمان دووفاقی لامارتینن.

مارسی ٢٠٠٥

# نیکۆس کازانتزاکیس و ژن

زۆرن ئەو نوسەرانەی لە بارەی ژنەوە بیر و رای خۆیان دەربڕیوە و ژن بۆتە یەکێك لە رەگەزە سەرەکی‌یەکانی نووسین، وەلێ کەمن ئەو نوسەرانەی کە بە گشت پەنهانەکانی رۆحی ژن ئاشنا بوون، بێگومان مرۆڤ بونەوەرێکە هەلگری تەفسیرگەلی جیاوازە، چونکە تاکە بوونەوەری هۆشەکی سەرزەوییە، وەلێ ژن هەم وەکو مرۆڤ هەلگری سیفەتگەلی خۆیەتی و هەم وەکو مێینەش کائینێکی ئالۆزو فرە ڕەهەندە، کە هەر لەسەرەتای مێژووەوە هەلگری تایبەتمەندی بووە و سروشتیش چەندین تایبەتمەندی‌تری بەخشیوەتە ئەم بوونەوەرە، کە ژنە.

یەکێك لەو نوسەرانەی توانیویەتی کەشفی زۆرێك لە جوانیەکانی ژن بکات و وەکو بوونەوەرێکی میهرەبان و خاوەن ئیرادە ژن سەیر بکات (نیکۆس کازانتزاکیس)ە، ئەم نوسەرە لەزۆرێك لە بەرهەمەکانیدا پێگەیەکی تایبەت و



دیاری داوەتە ژن و ئەو یەکسانییەی نێوان هەردوو رەگەزی لە چەند رۆمانێکدا دووبارە کردۆتەوە و ئەوینی ژن وەکو پێویستیەکی هەمیشەیی بۆ ژیانی پیاو دەبینێ و ئەو لە یاداشتەکانییدا دەنووسێ؛ لە راستیدا ئەگەر دڵی میهرەبانی ژن نەبوایە، ئەوا خودا هەتا هەتایە پیاوی لە نێو گۆڕ دەنا، ئاخر رزگاری ئێمە بەتاڵێك دەزووەوە بەندە، رزگاری ئێمە بە هاواری ئەڤینەوە بەندە، کەواتە کازانتزاکیس پێیوایە ئەوە ئەوینی ژنە رۆحی پیاو لەکۆت و بەندەکانی ژیان رزگار دەکات و بە ئەڤین دەوڵەمەندی دەکات، چونکە پێیوایە تەنها ئەڤین دەتوانێ رۆحی مرۆڤەکان لەترس و مەرگ رزگار بکات.

لەلایەکی ترەوە نیکۆس کازانتزاکیس ژن وەکو فریادرەسێك دەبینێ کە دەستی پیاو دەگرێت و بەرەو بەهەشت رێنمایی دەکات و لەم بارەیەوە دەنوسێت؛ بۆ یەکەم جار لەژیانی بێڕوحم و نائینسانیدا تێگەیشتم کە خودا چەندێك میهرەبانە! کە خودا چەندێك ئینسانی خۆشدەوێ و بەزەیی پێیدا دێتەوە! کە ژنی بەو هەموو دڵڕفێنییەوە بۆ خولقاندووە تا دڵنیاترین و نزیکترین رێگەوە رێنومایمان بەرەو بەهەشت بکات. واتە ئەوە ژنانن دەبنە ئەلتەرناتیڤی رزگاربوونی پیاوان لە دۆزەخ و هەر

ئەوان بەرەو بەهەشت رێنمایی دەکەن. هەروەها پێیوایە ئەو پیاوەی خاوەنی ژنێك بێت هەژاری و رووت و رەجاڵیی هیچ نیە؟ چونکە ژن هەموو بەختەوەریەکی ژیان بۆ پیاو بەرجەستە دەکات، بێگومان لێرەدا مەبەستی ئەوەیە کە ئەوە ژنانن دەتوانن جوانتر لە پیاوان رێز لەبەهاکانی ژیان بگرن و بەرنامەی تۆکمە بۆ ژیانی هەردوو رەگەز پێکەوە دابنێن.

دواجار دەتوانین بەکازانتزاکیس بڵێین نوسەری داکۆکیکەر لە ژن و ژیاندۆستی و هەڵگری بەیداخی یەکسانی نێوان هەردوو رەگەز.

شوباتی ٢٠٠٥



# ژنان بۆ کێ دەنوسن؟!

رەنگە سەرەتاییترین پرسیار کە لە نوسەر دەکرێ ئەوە بێ کە بۆ کێ دەنوسێ؟ بێگومان هەموو نوسەر و شاعیرێ بۆ کەسێ دەنوسێ کە رەنگە ئەو کەسە خودی نوسەرەکە بێت، یان کەسێك بێت کە سەرنجی نوسەری راکێشابێت جا ئیتر بە جوانی ئەو کەسە بێت، یان دانایی، یان هێمنی...هتد، پێموایە ئەو پرسیارە پێش ئەوەی لە پیاوە نوسەرەکان بکرێت زیاتر رووبەڕووی ژنە نوسەرەکان دەکرێتەوە، چونکە ئەوان ژمارەیان کەمترەو هەمیشە لە کۆمەڵگا سوننەتی و تەقلیدیەکاندا لە لایەن رەگەزی بەرامبەرەوە بە چاوێکی گومانا‌وییەوە سەیر کراون، بۆیە دەکرێ لە ستونێکی ئاوهادا قسە لەسەر ژنە نوسەرە کوردەکان بکەین، کە ئایا ئەوان بۆ کێ دەنوسن؟

فیرجینیا وڵف لەمەڕ پرۆسەی نوسین لای مێینە دەنوسێ؛ نوسینی هەر ژنێك هەمیشە ژنانەیە و ناتوانێت ژنانە نەبێت. دەکرێت لێرەدا مەبەستی "وڵف" ئەوەبێت کە هەموو ژنانی نوسەر هەڵگری ئیحساسی ژنانەی خۆیانن

و ناتوانن خۆیان لەو سنورە بدزنەوە، هەر ئەمەش وایان لێدەكات ژنانە بنوسن وبیربكەنەوە، بەڵام ئایا تا چەند ژنە نوسەرە كوردەكان، یان ئەگەر باس لە خانمە گۆرانیبێژەكانیش بكەین توانیویانە پەیڕەوی ئەم خاڵە بكەن و كە بەرهەمێ یان گۆرانییەكی ئەو خانمانەت بینی بزانی ئەوە لە هەستێكی مێینەوە هاتۆتە بوون، بێگومان لە زۆرێك لەو نوسین و بەرهەمانەشدا هەستی مێینەیی لاوازە یان نییە و ئەو خانمە نوسەر و هونەرمەندانە نەیانتوانیوە گوزارشت لە خودی ئازار و كێشەكانی خۆیان بكەن، ئەو ژنانەشی توانیویانە ئازادانە گوزارشت لە هەست و نەستی مێینەتی خۆیان بكەن و سنورە تەقلیدیەكانی نوسین تێبپەڕێنن و بەرەو جیهانی فراوانی ئەدەب و هونەر هەنگاو بنێن و بێ سانسۆری كۆمەڵایەتی شیعرو چیرۆك و رۆمان بنوسن ژمارەیان زۆر كەمە، بۆیە دەكرێت هەموو خانمە نوسەر و هونەرمەندەكان بەر لە بڵاوكردنەوەی هەربەرهەمێكی ئەدەبی یان هونەری دەبێ بیر لە خزمەتكردن و جۆری خزمەتكردنەكە بكەنەوە بە دۆزی ژن ئەركی یەكەمی هەموو نوسەر و هونەرمەندێ خزمەتكردنە بە مرۆڤ و ژیان.



دواجار دەتوانین بڵێین ئەو بەرهەمەی ژنێك پێشكەشی كۆمەڵگایەكی دەكات پێش هەموو شتێ دەبێ خزمەت بە خودی خۆی و رەگەزەكەی و كۆمەڵگاكەی بكات ئەوسا رەگەزی بەرامبەر و كۆمەڵگاكانیتر ئەگەر وانەبوو ئەوە بەرهەمێكی لاوازە و ناچێتە خانەی ئەفراندنەوە، بەڵام ئەگەر خزمەتی كرد ئەوە هەقە هەم نوسەرەكەی و هاورەگەزەكانی شانازی پێوەبكەن و هاندەری بن و پشتگیری لێبكەن.

# شۆپنهاوەر و ژن

نووسین پرۆسەیەکە بۆ جوانکردنی جیهان و ئاشناکردنی هەموو مرۆڤێك بە ئەو لایەنە شاراوانەی بوون و ژیان کە پەییان پێنەبراوە و چاوی نووسەر دەرکی بەو لایەنانە بردووە، بۆ سەلماندنی ئەم قسەیەم حەز دەکەم ئەم وتەیەی نووسەری بەناوبانگی جیهانی (ساموائیل جۆنسۆن) بهێنمەوە کە دەڵێت؛ ئەرکی نووسەر و شاعیر جوانترکردنی دنیایە لەوەی کە هەیە. بێگومان جوانکردنی دنیا لە رێی بیروبۆچووی ژیاندۆستی و تەبایی و قبولکردنی جیاوازیەکانەوە دەبێت، ئەو جیاوازیانەی کە ژیان بەهەمەرەنگی دەهێڵنەوە و لەیەکرەنگی و تاك رەهەندی قوتاری دەکەن. کەمنین ئەو نوسەرانەی لە پێناوی ئەم لایەنەی ژیاندا هەموو تەمەنی خۆیان بە نووسین بەخشی و ئێستا وەکو پەیامبەری ژیاندۆستی ناو دەبرێن بوونەتە خاوەنی پێگەو پلەی تایبەت لە مێژووی نەتەوەکەی خۆیان و جیهاندا، بەڵام کەمیش نین ئەو نوسەرانەیروانینێکی پوچگەرایانەیان بۆ ژیان و هەموو



بووەکانی تری کۆمەڵگە و لە نێو هەموو نوسینەکانیدا روانینێکی پوچگەرایانەی هەیە،کە ئەمانیش لە نێو وڵاتی خۆیان و جیهانیشدا بە رەشبین و پوچگەرا ناسراون، واتە تەنها دیووە تاریکەکەی ژیان و هەموو بووەکانیتر دەبینن، ئەوەی من دەمەوێ قسەی لەسەر بکەم روانینی فەیلەسوفی پوچگەرایی (شۆپنهاوەر)ە بۆ ژن و تەفسیرکردنی ژن لە ژیانی پیاودا.

دیارە نوسەرێك کە بنەماکانی بیری خۆی لەسەر پوچگەرایی دانابێ، روانینی بۆ (ژن)یش روانینێکی ئەکتیڤ نابێت، بۆیە ئاساییە ئەگەر روانینی یەکێکی وەکو شۆپنهاوەرلەمەڕ ژن ئەکتیڤ نەبێت،چونکە شۆپنهاوەر لەمەڕ یەکسانی ژن و پیاو دەڵێت؛ ژن بوونەوەرێکی ناتەواوە و شایانی هیچ پەروەردە و فێرکردنێك نییە. ئەم بۆچوونە رەتکردنەوەیەکی تەواوەتی رەگەزی بەرامبەر و سوك سەیرکردنێکی زۆری تێدایە بۆ ئەو رەگەزەی بێ ئەو ژیان بەردەوام نابێت و هیچ مانایەك بەردەوامیەك و نامێنێتەوە هاوکێشەی ژیان هاوسەنگ نابێت، لێرەدا تێدەگەین کە ئەم نوسەرە هەرگیز ژنی لە ئاستی پیاودا نەبینیووە، بەڵکو بە بوونەوەرێکی پلە دووی داناوە. هەروەها لە شوێنێکیتردا

دەڵێت؛ ژن رەگەزێکی بێ هونەرە و جێی باوەڕنییە. بێگومان ئەم رایە لەو بۆچوونە پوچگەراییانەوە سەچاوەی گرتووە سەتاپای بیر و نووسینی ئەم نووسەرە گرتبووەوە و رەنگە هەرئەم بۆچوونانەشی بووبێتە سەرچاوەی کاریگەرییەکی زۆرلەسەر روانین و دنیابینی گەورەی فەیلەسووفی ئەڵمانی (نیچە)کە ئەویش بۆچوونێکی لەم باشتری لەمەڕ ژن نەبوو. لە لایەکیترەوە ئەگەر وردتر رۆبچینە ناوبیری ئەم فەیلەسووفەوە درك بەوە دەکەین کە ترسێکی زۆری بەرامبەر بە ژن هەبووە ئەو ترسەش وایکرردووە بڵێت؛ ژن بۆ زنجیرکردنی پیاو دروست کراوە. رەنگە سەرچاوەی ئەم ترسە لە کێشەیەکی تایبەتییەوە سەرچاوەی گرتبێ ، یان کاریگەرییەکی راستەوخۆی ژینگەو دەورووبەرە و پێموایە ئەم رایەی دوایی سەرچاوەی هەموو بۆچوونە نێگەتیڤەکانیەتی لەسەر ژن.

دواجار دەمەوێ ئاماژە بەقسەکی ناپلیۆن بکەم کە دەڵێت ؛ داگیر کردنی وڵاتێکیگەورە ئاسانترە لە دڵی بچووکی ژنێك ، لێرەوە دەگەینە ئەورایەی شۆپنهاوەریش وەکو ناپلیۆن رەنگە لە هەموو تەمەنیدا نەیتوانیبێ دڵی



ژنێك داگیر بکات و جێی خۆی تێدا بکاتەوە، بۆیە هەمیشە بە چاوێلکەیەکی رەش لە ژن و ژیانی روانیوە.

مایسی ٢٠٠٥

# ماركیز و ژن

"ژن هێزی راستەقینەی سروشتە"

"ماركیز"

ئەگەر سەیری سەرجەم بەرهەمی نوسەرانی دنیا بكەین و زیاتر رۆبچینە نێو ژیانی تایبەتیانەوە دەبینین ژن رۆڵێكی بەرچاو و دیاری لە ژیانی نوسەراندا هەبووە، هەر ئەم رۆڵەش بۆتە هۆی رەنگدانەوە لە بەرهەمی نوسەراندا. بێگومان هەموو نوسەران وەكو یەك لە ژنیان نەڕوانیوە و هەریەكەیان خاوەنی تێڕوانینی جیاواز بووە لەمەڕ ژن، هەندێكیان رای زۆر نێگەتیڤیان هەیە لەسەر بوونی ژن لە گەردووندا و دواتر لە ژیانی پیاودا، بەڵام كەمیش نین ئەو نوسەرانەی رای پۆزەتیڤیان هەیە لەسەر ژن و لە دیدێكی ژیاندۆستیەوە روانیویانەتە پێكهاتەی عەقڵی و سروشتی بیركردنەوە و مامەڵەكردنی ژن لەگەڵ رەگەزی بەرامبەردا، یەكێك لەو نوسەرانەی زۆر



پۆزەتیڤانە لە ژنی روانیوە و زۆرێك لە بەرهەمەكانی خستۆتە خزمەتی دۆزی ژنەوە (گابریل گارسیا ماركیز)ە. ماركیز لەزۆربەی نوسین و رۆمانەكانیدا بەرگریەكی زۆر لە ژن دەكات و ئەو بەچاوێكی پڕ لە میهرەبانیەوە لە ژن دەڕوانێت، ئەگەر بڕوانینە ژیانی خێزانی ئەم نوسەرە دەبینین لە سەرەتای منداڵیدا چەند ساڵێك لای نەنك و باپیری ژیاوە و دواتریش كە گەڕاوەتەوە بۆ خێزانەكەی لە كەش و هەوایەكی پڕ لە سۆزو میهرەبانیدا بەخێوكراوەو پاشانیش كە خێزانی لەگەڵ(مارسیدس) پێكهێنا ئەوەندەی تر دەرگای میهرەبانی ژنی بۆ كرایەوە، ئەمانە یەكەمین كاریگەرین لەسەر بیری ئەم نوسەرە لەمەڕ ژن و روانینێكی پۆزەتیڤانە بۆ مافەكانی مێینە.

ماركیز لە رۆمانی (پایزی باوكسالاریدا) باس لە پیاوانی زۆردار دەكات كە هەم زۆردارن بەسەر كۆمەڵگەوە بەگشتی و هەم زۆرداریشن بەسەر ژنەوەو هەوڵی فەرزكردنی دەسەڵاتی خۆیان دەدەن بەسەر مێینەدا.پەترياركی ماركیز، كە وەكو پێكهاتەیەكی هەموو دیكتاتۆرەكانی ئەمریكای لاتینی تەماشا دەكرێت، لە بنەڕەتدا بریتییە لە كەسایەتییەكی خەمبار كە سۆزی ئەوانی دی دەوروژێنێت، دەشێت مرۆڤ بخوازێت كە وێنەیەكی قێزەونترو ناشیرین

تری بە دیکتاتۆر ڕەوابببینیایە، بەڵام تاکە چەکی نوسەر کەبەڕووی ستەمکاری ناو ڕۆمانەکەیدا بەرزی دەکاتەوە، بریتی‌یە لەگەمەو گاڵتەجاڕی، هەروەها خەیاڵی زیادەڕۆی و نامۆگەرایی سەیرو سەمەرەیی کەسایەتی دیکتاتۆر کەدەیکات بەکەسایەتیەکی کاریکاتۆری و زۆردارێکی زەلیل و دیکتاتۆرێکی نەشارەزا، هەروەها چیرۆکی"پرسەی دایە گەورە" چیرۆکێکی نائاساییە و پڕیەتی لە چیرۆکی سەیر و سەمەرە و نائاسایی و خەیاڵی. چیرۆکبێژ بەشێوەی ئەو فرۆشیارانەی لە بازاڕدا هاوار دەکەن، بەم شێوەیە چیرۆکەکە دەکاتەوە: " ئەی هەموو ئەو کەسانەی باوەڕ ناکەن، ئەمە حیکایەتی راستەقینەی دایکی گەورەیە، حاکم و دەسەڵاتداری رەهای مەملەکەتی ماکۆندۆ، لەپێناوی دەسەڵاتەکەیدا نەوەد و دوو ساڵ ژیا، لە یەکێ لە ڕۆژەکانی سێشەممەی ئەیلەلی رابردودا، لەو پەڕی پاکیزەییدا گیانی سپارد و پاپاش لە پرسەکەیدا ئامادەبوو". لەوە دەچێ ئەم پاکیزە دیکتاتۆر و خاوەن دەسەڵات و خورافییە ئەنتەرناتیڤی. پەتریاکی مارکیز بێت لە ڕۆمانی "پاییزی پاتریارك" ١٩٧٥.

لەلایەکی ترەوە لە ڕۆمانی (یادەوەری سۆزانیە خەمبارەکانم)دا مارکیز لەم ڕۆمانە نوێیەیدا رەخنە



کۆمەڵگای نێرایەتی دەگرێ لە میانەی تیشك خستنە سەر ئەو ژنانەی لەخانەی خوارەوەی کۆمەڵگەدا دەژین وەکو سۆزانیەکان و کارەکەرەکان، بەڵام مارکیز لە پەراوێزی ژیانەوە هەڵیان دەگرێ و دەیانخاتە ناو مەتنی گێڕانەوەکە هەر وەکو ئەوەی لەو کۆت و پێوەندە جۆرا و جۆرانە رزگاریان بکات بەرەو فەزای ئازادی لەسەر لاپەڕەکانی ڕۆمانەکە. ئەو لایەنگیریەی مارکیز بۆ ژنە چەوساوەکان هەیەتی رەگەکەی بۆ ساڵانی دووری سەردەمی منداڵی دەگەڕێتەوە لە یادەوەریەکانیدا (ژیان لە پێناو گێڕانەوەدا) دان بەوەدا دەنێ کە لە جەوهەری شێوازی ژیان و بیرکردنەوەیدا قەرزارباری ژنانی خێزانەکەی و ئەو ژنە کارەکەرانەیە کە لە منالێیدا خزمەتیان کردووە. ئەو ژنانەی کەسێتیەکی بەهێز و دڵێکی فراوانیان هەبووە و بەشێوەیەکی خۆڕسکانەی بەهەشتێکی سەرزەوی رەفتاریان لەگەڵدا دەکردم. لە دیدارێکدا لە مارکیز دەپرسن؛ لەرۆمانە هەرە دیارەکانتدا (سەد ساڵ تەنیایی) و (پاییزی باوکسالار) بەشێوەیەکی زۆر جیاواز مامەڵەت لەگەڵ کارەکتەری ژندا کردووە. لە یەکەمیاندا جیهانی مێینە زۆر بەهێزە، ژنان لەوێدا بە ئاشکرا تایبەتمەندی زیاتریان لە پیاوەکانی هەیە، هەمووشیان بە یەك ناو

ناویان دەبرێن "خوزیە ئەرکاردیو بویفیدیا" بەڵام لەلایەکی ترەوە لە (پاییزی باوکسالار)دا ژنان تەنها لەڕێی پەیوەندیان بە پیاوەوە بوونیان هەیە. ئەمە چۆن لێك دەدەیتەوە. ئەویش لەوەڵامدا دەڵێت؛ ژن تاڕادەیەکی زۆر جێی بایەخی منن. کارەکتەری ناونیشان لە (پاییزی باوکسالاردا) رەهایە و نایەوێت پشت بەکەس ببەستێت، بەڵکو داوا لە هەموان دەکات کە خودایشیان لەگەڵدا بێت پشت بەو ببەستن. لەگەڵ ئەمەیشدا کە لەپاتریاکدا دوو نوختەی لاوازی گەورە هەیە، هەردوکیان پەیوەندیان بە ژنەوەیە، ژنان وایان لێکردبوو خەریك بوو سەری خۆی لەدەست بدات، بۆیە لەگەڵ ئەوەیشدا ئەو وای دەزانی نوێنەری بەرجەستەی هێزێکی رەهایە، بەڵام گومان لەوەدا نیيە کە ئەو دوو ژنەی لە رۆمانەکەدا کەسایەتی سەرەکین، وایان لێکردبوو هاوسەنگی نەهێڵن. بەلای مارکیزەوە (ژن هێزی راستەقینەی سروشتە) هەروەها دواتر دەڵێت؛ هەوڵ دەدەم ئەمە لە چیرۆك و رۆمانەکانمدا بەرجەستە بکەم، لە بەرهەمەکانمدا وا دەردەکەوێ کە ژن دنیای لەناو دەستایە، بەڵام پیاو گەمژانە رەفتار دەکات ئەمە بیر و رای راستەقینەی منە.



هەروەها مارکیز لە چاوپێکەوتنێکیتردا دەڵێت؛ من لە هاوڕێیەتیا جیاوازی لە نێوان ئافرەت و پیاو ناکەم، بەڵام لەگەڵ ئافرەتدا بەختیارترم. هەر لە چاوپێکەوتنێکی تردا مارکیز لەوە ئەدوێ کە هەر لە منداڵیەوە ئافرەت کاری گەورەی لەسەر ژیانی بووە و دەوری ئەوەی هەبووە کە لە گەورترین تەنگ و چەڵەمە رزگاری بکات تا ئەوەی وەك بۆچونێکی میسالیانە بڕوای بەوە بێت کە تا لەگەڵ ئافرەتا بێت گیروگرفت نەیەتە رێگای و هەست بە دڵنیایی بکات ئەگەر ئەو دڵنیاییە نەبوایە نەیئەتوانی نیوەی ئەو کارە چاکانەی بکات کە بەرهەمی هێناون، بەتایبەت لە بواری نوسیندا.

مارکیز لە رۆمانەکانیدا و بەتایبەت لە (سەد ساڵ تەنیایی)دا بێئەوەی مەبەستی بوبێت یا دەستی ئەنقەستی تیابێت هەمیشە دەوری پارێزگاریکردنی رژێمی کۆمەڵایەتی داوەتە دەست ژن و پیاویشی لا ئاژاوەچی و هەرزەکار و سەرەڕۆ بووە. کە رەخنەگرەکان ئەم دیاردەیەیان دۆزیوەتەوە و مارکیز پێی قایل بووە و وا پاساوی ئەدات کە (هەر لە منداڵیەوە بەهۆی ئەو چیرۆکانەوە کە بۆیان گێڕاوەتەوە و باسی شەڕی ئەهلیان کردووە ئەم هەستەی لا دروست بووەکە لە ئافرەتدا

هێزێکی گەورە هەیە بەرامبەر ترس و کارەساتە گەورەکانی رائەگرێ، بۆئەوەی بەردەوام بێ لەسەر نەوە خستنەوە و پاراستنی نەژادی مرۆڤ، لەکاتێکدا پیاوان ئەچوون بۆ جەنگ و چەکەکانیان بە شانەوە بوو و نەیان ئەزانی بۆکوێ ئەچن و چیان بەسەردێ ژنەکانیان تەنیا ئەمان و نەوەی تازەیان بۆ جێگای ئەوان دەخستەوە. وەك ئەو ئافرەتە یۆنانیانەی لەکاتی بەڕێکردنی مێردەکانیاندا بۆ شەڕ پێیان ئەوتن: " کە گەڕانەوە لەژێر رەخت و مەتاڵی شەڕەکانتانا بن، یان بەسەریانەوە هەڵیگرابن، زیندوو یا مردوو، بەڵام نەکەن بە بەزیو و شکست خواردووی بگەڕێنەوە") هەروەها مارکیز لە ژیانی هاوسەرێتیشدا یەکێك بووە لە بەختەوەرترین ئەو پیاوانە و لەو بارەیەوە دەڵێت: تا ئێستا لەگەڵ هاوسەرەکەمدا هیچ ناکۆکیەك نەکەوتۆتە نێوانمانەوە و ئەویش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە پێش زەواج چۆنمان لە شتەکان روانیوە ئێستاش وایە.

مارکیز یەکێکە لە ژیاندۆستترین نوسەرانی ئەمڕۆی دنیا و بە وردبوونەوە لە هەموو بەرهەمەکانی ئەم راستیە دەبینرێت، هەروەها هەرگیز لە هیچ بەرهەمێکدا دێڕێکی دژی ژن نەنوسیووە، بەڵکو هەموو بەرهەمەکانی خستۆتە



خزمەتی بەدەست هێنانی مافەکانی ژنان و داکۆکیکردن بۆ دەستەبەرکردنیان، هەر ئەمەش مارکیزی بە ئەدەبێکی زیندوو هێشتۆتەوە تا بەرهەمەکانی لەسەر ئاستی جیهاندا ناسرا.

حوزەیرانی ٢٠٠٥

# قسەیەك لەمەڕ پرۆسەی هاوسەرگیری

هاوسەرگرتن یەكێكە لەو پرۆسانەی كە لاوانی ئەمڕۆ تاڕادەیەكی زۆر لێی سڵەمیونەتەوە زۆر لە لاوان هەرخۆشیانی لێدەدزنەوە، بێگومان ئەمەش لەبەر تەنها هۆیەك نیە، بەڵكو لەبەر كۆمەڵێ هۆی یەك لە دوای یەكە وەكو كەمدەرامەتی زۆرێكی لاوان هەروەها نەبوونی شوێنی نیشتەجێ بوون و نائاسوودەیی دەروونی لاوان ... هتد، بێگومان هەر ئەمەش وای كردووە قەیرە بوونی كچان روو لە زیاد بوون بكات، بەڵام بەدەر لەمانە پرسیاری جەوهەری ئەوەیە كەی لاوان بڕیار لەسەر هاوسەرگرتن دەدەن، كەمن پێموایە ئەمە كاریگەری باشی لەسەر ئایندەی ژیانی ئەو لاوە دەبێت، هەندێ لە دەروونناسەكان دەڵێن، تەمەنی(١٨) ساڵی شیاوە(واتەپاش بالق بوون)، چونكە كەسێتی لاو لە رووی فسیۆلۆژی و سایكۆلۆژییەوە بۆ ئەو پرۆسەیە ئامادە دەبێت، بەڵام هەندێكی تر پێیانوایە كە پاش(٢٢) ساڵ گونجاوە، بە



دەلیلی ئەوەی زۆرێك لە لاوان تا ئەو تەمەنە لە ڕووی فسیۆلۆژییەوە كامڵ نابن. ئەم ڕایانە هەموویان گونجاو و لەجێی خۆیاندان، وەڵێ ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ لای تۆلستۆی كە لە رۆمانی(شەڕ و ئاشتیدا) دەڵێ؛ ژن مەهێنە تا دڵنیا نەبیت لەوەی ناتوانیت نەهێنیت!مەیهێنە تا تەمی ئارەزووكردنی ئەو ژنەی شەیدایی كردبیت، حەقیقەتی ژنە نەبینیت، تا دەتوانیت درەنگ ژن بهێنە!...

ئەم قسانەی تۆلستۆی هەمووی لە جێی خۆیدایەتی و مرۆڤ كاتێك بیر لە پێكهێنانی هاوسەر دەكاتەوە تەنها بە شەیدایی رووخسار و رووكەشی كەسی بەرامبەر نەبێت، چونكە زۆرجار رووخسار پێچەوانەی ناوەڕۆكە و مرۆڤەكانی ئەمڕۆ سەدان دەمامكیان لە رووی خۆیان داوە، بۆیە دەكرێ كاتێك لاوێك بیر لە هاوسەرگرتن دەكاتەوە، دەبێ زۆر وشیارانە بیر بكاتەوە و بزانێ ئەو كەسەی كە دەیكاتە هاوسەری چۆنە و كێیە و تا چەند گونجاوە لەگەڵ ژیان و بیروبۆچون و ئەو ژینگەیەی كە تێیدا دەژی.

دواجار دەبێ ئەوەشمان لەبیر نەچێت كە سەرەكیترین كێشە لەبەردەم ئەم پرۆسەیەدا گرفتی نیشتەجێ بوونە،

کــه تــا هەنووکــەش چارەســەر نــەکراوە، بــەڵام دەکــرێ حکومــەتی هــەرێم بــیر لــە رێگــە چــارەی گونجــاو بکاتــەوە بەکردنەوەی شوقە بۆ لاوانی تازە بەهاوسەربوو کەپێموایــە ئەمە هەندێ لەگرفتەکان چارەسەر دەکات.

تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤

# بەشی سێیەم

## ئیستاتیکای ژن

ئەم وتارانەی لەم بەشەدایە چەند سەرنجێکە لەسەر چەند بەرهەمێکی ژنانی نووسەر و ویستوومە لە رێی ئەم نووسینانەوە پەی بەو کارگەرییە سۆسیۆسایکۆلۆژیەکان لە نێو دەقدا بخەمە روو.



## پشوویەك بۆ مردن

### لە شیعرێکی شیرین.ك-دا

شیعر ئەو ژانرەیە کەزۆرترین راڤە هەڵدەگرێت و دەکرێت شیعرێك بەچەند جۆر لێکبدرێتەوە و لەهەمان کاتیشدا هەموویان راست بێت، هەمیشە شیعر جیا لەژانرەکانی تر نزیکتربووە لەخەمەکانی ئینسان و هەڵگری زۆرترین نیگەرانی و بێزاریەکانی دڵی مرۆڤ بووە، بۆیە کاتێك قسە لەسەر چرکە ساتێکی وروژانی دەروونی بکەین لای شاعیر، ئەوا ئێمە هەوڵی شیکردنەوەی ئەو چرکە ساتە ئەدەین، چونکە شیعر شاعیرە لە شێوەی وشەدا، هەروەها دەمێکەیە وتراوە شیعر پێناسەیەکی نەگۆڕی نییە، پێناسەی شیعریش وەکو شیعر خۆی لە گۆڕاندایە. لێرەوە ئەرکی رەخنەگرو توێژەر گرانتر دەبێت هەربۆیە زۆرێك لەو نوسینانەی لەسەر شیعر دەنوسرێت

نەك پەییان بەئاماژەكانی ئەودیوی دەق نەبردووە، بەڵكو سایكۆلۆژیای شاعیریشیان فەرامۆشكردووە و تەنها لەسەر روخساری دەق قسەیان كردووە. كەواتە كاتێك باس لە شیعر دەكەین بێ ویستی خۆمان باسمان لەخودی شاعیریش كردووە ولەوێشەوە باسمان لەو كۆمەڵگەیە كردووە كە شاعیری تێدا گەورە بووە، واتە شاعیر پەیوەندیەكی راستەوخۆی بەكۆمەڵگەوە هەیە و بەردەوام ئازار و خەمەكانی لەكۆمەڵگەوە رێچكەی گرتووە ئەمەش دەمانباتەوە بۆ ئەوقسەیەی(ئەلفرێد دۆمۆسە) كە دەڵێت؛ فرمێسكی شاعیر هەتوانی كۆمەڵگەیە. لێرەوە ئەركی شاعیر گرانتر دەبێت، چونكە بەپێی قسەكەی دۆمۆسە پەیامی شاعیر گەیاندنی ئەو شتانەیە كە دەبنە سارێژكەری برینی كۆمەڵگە. شیعر بۆ ئێستا و نەوەكانی تریش بۆشاییەكی گەورەو دورو درێژی لە ناو مەملەكەتی تێكشكاندنی گیانەكاندا داگیركردووە و داگیر دەكات. سۆزێكی بە گوڕو بەردەوامە هەر دەشمێنێ بۆ پڕكردنەوەی ویستی نەوەكان بۆ ئەوەی لە شنەبایەكی ئازادیبەخش و دوور لە سانسۆری هزرەكان گوزارشت لە خۆیان دەوروبەریان بكەن و تێكەڵاوی هەوای سازگاری زەمەنی دنیای نوێ و مۆدێرنە بن.



دەكرێت لەم سەرەتایەوە قسەیەك لەسەر شیعری(پشویەك یان..؟)ی خاتوو(شیرین.ك) بكەین و هەوڵی خوێندنەوەی چەند لایەنێكی بدەین.(شیرین.ك) یەكێكە لەو خاتوونە شاعیرانەی بەدەر لە شیعر سەرقاڵی چیرۆكنوسینیشە و كە ئەمەش بەرای من كاریگەرییەكی تایبەتی لەسەر شیعرەكانی ئەم خاتوونە داناوە و كاتێك شیعرێكی(شیرین.ك) دەخوێنیتەوە هەست بەو فەزای چیرۆكئامێزیە دەكەین، ئەگەرچی هەندێ جار چیرۆكەكان بچڕبچڕیش بن وەكو لەم شیعرە دا هەست پێدەكرێت، بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێم لەم شیعرەدا وێنەكانی ئەو چیرۆكە جیایە كە تاكۆتایی شیعرەكە هاوسەفەری خوێنەرن دەنا پەیامی ئەو چیرۆكەی لەپشت دەقە شیعریەكەوەیە پەیامی بێزارییە، بێزارییەك كەتەواوی كۆڵان و دەرگاو ماڵو هەموو شوێنێكی گرتۆتەوە بەدڵی نوسەریشەوە،ئەگەر هەرلەناونیشانی شیعرەكەوە بڕوانینە نێو ناوەرۆكی ئەم شیعرە دەبینین(پشویەك یان..؟) شاعیر لە ناونیشانەكەوە خوێنەر دەخاتە بەردەم پرسیارێك كە دەبێ پاش خوێندنەوەی دەقەكە خوێنەر وەڵامیبداتەوە ئەو پرسیارەش ئەوەیە ئایا ئەوەی لەكۆی ئەم دەقەدا لای خوێنەر دروست دەبێ پشووە، ئەگەر پشووە، پشووە

بۆچی؟ بۆ ژیان یان بۆ مردن، یان بۆ ئاوابوونی زەمەنی نیگەرانی، یان پشویەکی درێژە بۆ دیسان چاوەڕوانکردنی گۆدۆ. ئەمانەو دەیان یانی تر کە پاش خوێندنەوەی ئەم دەقە لای خوێنەر گەڵاڵە دەبێ، بۆیە لێرەوە فرە راڤەیی بۆ دەق دەستپێدەکات.

شاعیر سەرەتا دەڵێت؛

لەمڕۆوە
کەس بەم کۆڵانانا گوزەر ناکا
رەنگە ئەمیش پێویستی بەپشوو بێت.
رەنگە ئەمیش لەو هەموو
هەنگاوانەی شەو و رۆژ
بەسەریا هەڵدەنرێ
ماندووبێ.

بەسەرنجدانێکی ورد لەم چەند دێرە بۆمان دەردەکەوێت کات لەم شیعرە دا ئێستایەو (ئەمڕۆکەس بەم کۆڵانە گوزەرناکا)، واتە ئەم شیعرە چیرۆکی دوێنێیەکی بەسەرچوومان بۆ ناگێڕێتەوە و ئەمڕۆ کۆڵان و دەرگاو پەنجەرە هەست بەماندوو بوون دەکەن دەیانەوێ پشویەك بدەن، یان بڕۆکس وتەنی؛ شیعر بەرجەستەکردنی بیرۆکەیەکی پێشوەخت نییە و شیعر



شتێك بە خوێنەر ناگەیەنێت، بەڵکو خۆی بە خوێنەر دەگەیەنێت، واتە شیعر دەرککردنێکی هەنووکەییە بە بوون و پێشهاتەکانی ژیان، لێرەدا پەیامی ئەم شیعرە گێڕانەوەی بێزاریەکانی رابردوو و زەمەنی دوێنێ نییە، بەڵکو ئەمڕۆ دڵی شاعیرێك لەهەموو شتێك نیگەران دەبێت. بێگومان دەبێ ئەوەبزانین ئەوەی نیگەرانی و بێزاری دروست دەکات ژینگە و کۆمەڵگەیەو ئەو دوانە بەرکەوتنی راستەوخۆیان هەیە لەگەڵ هەست و نەستی مرۆڤدا، کاتێکیش شاعیرێك نیگەران دەبێت ئەوا کۆمەڵگایەك بەرەونیگەرانی پەلکێشی دەکات و نایەڵێت لەگەڵ خەیاڵەکاندا لەئاسماندا لەشەقەی باڵ بدا، چونکە هەمیشە دووبارە بوونەوەی رۆژە لەیەك چووەکانی ژیانی مرۆڤ بەرەونیگەرانی و بێزاری دەبەن تادەگاتە رادەی مەرگدۆستی وەکو چۆن لای هەژار دەگاتە ئەوەی بڵێ؛(ئەی مردن لەکوێی ژیان کوشتمی).

ئەگەر لێرەدا بگەڕێینەوە بۆ پەیوەندی نێوان چیرۆك و شیعر، ساڵانێکە زۆرێك لە نوسەرانی دنیا ئەوە دەڵێن کە سنور لەنێوان ژانرە ئەدەبیەکاندا نەماوە و تا رادەیەکی زۆر تێکەڵی کەوتووەتە نێوان هەموو ژانرەکانەوە و گرنگ نیە چۆن دەنوسی؟ بەڵکو گرنگە

چی دەنوسی؟ بەڵام لای خوێنەری کورد هێشتا ئەم تێکشکاندنی سنوربەندییە شتێکی نوێیە و راستە چەند هەوڵێك دراوە، بەڵام ئەو هەوڵانە لەنێو خوێنەردا نەچەسپیون. خاڵی نزیکی نێوان چیرۆك و شیعر "زمان"ە دەتوانیت بەو زمانەی چیرۆکێ دەنوسرێ بەهەمان زمانیش شیعر بنوسرێ، لەهەر چیرۆکێکدا ئەبێت شتێك ون بێت، یان ئامادە نەبێت بۆئەوەی لەدواییدا ئاشکرا بێت ئەگەر هەرشتێك لە شوێنی خۆیدا بێت ئەوا چیرۆکێك نامێنێتەوە بۆئەوەی بوترێ، ئەم ونبوونە ئازاراوییە لەهەمان کاتدا کاریگەرە و ئەو ئارەزووە ئەوروژێنێت کەناتوانین هەمانبێت، ئەمەش یەکێکە لە سەرچاوەکانی رازیکردنی چیرۆك ئەگەر هاتوو هەرگیز نەمانتوانی شتە ونبووەکان بەدەستبهێنین ئەوکاتە هەڵچونەکانمان تەحەمول ناکرێت و ئەبێت بە بێزاری؛ بەڵام ئەبێت ئەوە بزانین لە ئەنجامدا ئەو شتە هەر بۆ ئێمە دەگەڕێتەوە. لەم شیعرەشدا شتێك ونبووە کە ئەمەش خاڵێکی تری پەیوەندی نێوان چیرۆکبوونی ئەم شیعرەیە، ئەو شتەش کە ونبووە پشویەکە بۆ...؟ شاعیر خوێنەر سەرپشك دەکات چۆن و لە چیدا و بۆچی پشوو دەدات واتە دەبێت خوێنەر ئەو ونبوونە بدۆزێتەوە.



بێزاری پەنجەرەیەکی ترە لەو بەکارهاتوانەی شاعیر بەهاوسەفەری خۆی دەزانێ .پەنجەرە رەمزێکە بۆ هاتنە ژوورەوەی تیشکەکانی ژیان بۆ ناو شوێنێکی تاریك، یان شوێنی روانینی کەسانی ناکام و دیل کراو بۆ دەرەوەی تاریکی پاش پانتاییەکانی ژیان، ئەگەر پەنجەرە نەبێت چیتر مرۆڤ روانینی بگرێتە کوێ؟ بەڵام بێزاربوونی پەنجەرە لەو هەموو روانین و تەماشا و سەیرکردنە بێشومارە لەوێوە سەرچاوە دەگرێ کە هیچ کام لەو روانین و سەیرکردنانە سەیرکردنێکی ئارامبەخش و پڕ ئاسودەگی نین، چونکە وەکو پێشتریش وتم؛ ژیان لە دووبارەبوونەوەدایە ودەبێ مرۆڤ دنیا بەجۆرێکی تر ببینێ، واتە سوهراب وتەنی؛ چاوەکانت بشۆ و دنیا بە جۆرێکی تر ببینە. دواتر شاعیر دەڵێت؛

لەمڕۆش بە دواوە
کەس، هیچ کەس پەی بەڕێی دڵم ناباو
کەسێ دەرگاکەی نادۆزێتەوە
کەس کەسیش لە پەنجەرەیەکەی
ناڕوانێ و سەیری ناکا
رەنگە دڵیشم پێویستی
پشوویەك بێت.

شاعیر لەم چەند دێرەدا ئەو نیگەرانی و ناکامیەی بە یەکجاری دەخاتە روو تا پشوویەك بدات و بەڵام پرسیارەکە لێرەدا پشوو بۆچی دەدات؛ مرۆڤ تا ماندوونەبێت پشوو نادات ئایا دەیەوێت پشوویەك بدات بۆ پێشوازیکردن لە مەرگ، یان بۆ چیتر ... لێرەدا هەست بەمەرگدۆستی دەکەین لەم دەقەدا . مەرگ بەمانای باوەکەی نا، بەڵکو بە مانا فەلسەفیەکەی ، واتە مەرگی روانین و بیر و پرسیاری مرۆڤ لە دەوروبەرو ژیان . یان ئەگەر کۆجیتۆکەی دیکارت بۆ زیاتر روونکردنەوەی مەبەستم بەکار بهێنم (من بیر دەکەمەوە، کەواتە من هەم) واتە مرۆڤ رەنگە بە جەستە زیندووبێت، بەڵام بیر و ئەندێشەی مردووە ، یان بە پێچەوانەوە بە جەستە مردوو بە رۆح و هزر لەگەڵ ئێمەن، یان ئەو مردنەیە کە هەموو مرۆڤێك لە رێیدایە، وەکو سوقرات دەڵێت؛ کە مرۆڤێك لە ئومێد و خەیاڵ دابڕا، لە مردوویەك زیاتر هیچی تر نییە.

بۆیە لێرەدا دەمەوێ ئەوە بڵێم قسەکردنی شاعیر لەسەر(تەواو تەواو بێزار بوون) واتە وەستانی بیرکردنەوە که من مەرگی بیر کردنەوەی ناودەنێم، بەڵام رەگوڕیشەی ئەم مەرگدۆستیە لای شاعیر تازە نییە، بەڵکو ئەو لە



دیوانی (کەنارەکانی خەون-١٩٩٩) دا و لە شیعری "یاد" دەنوسێت؛

منی مرۆڤ، هەزارەها دەقەو سەعات
لە پڕێکدا
وەڕس دەبم
لەهەناسەیەکم یاخی دەبم
بەندی دەکەم...دەمرم.

دواجار دەکرێت بڵێین ئەو پرسیارانەی ئەم شیعرە خستیەڕوو پرسیار بوون لە جەوهەری ژیان و ئەو چرکەساتانەی مرۆڤ نغرۆی خەم و نیگەرانییە، یان دەتوانین بڵێین هەوڵێکە بۆ نووسینەوەی رۆژمێری ژنێکی تەنیا ، بەڵام لەگەڵ ئەوەی شاعیر لەدوا دێڕدا تەئکید لەسەر بێزاری دەکاتەوە، بەڵام ئومێدێك لە پشت دەقەوە ماوە لێرەدا مەرگ دێت، بەڵام پاش ئەو مەرگە ژیانەوە هەیە. . لە دواجاریشدا شاعیر لە پلەدا جیاوازە و لە هەمان جۆری مرۆڤیترنیین، شاعیر هەستیارییەکی ئێجگار زیندووی هەیە زۆر حەماسی و سۆزدارە و زانیارییەکی چڕی هەیە لە بارەی سروشتی مرۆڤەوە گیانێکی مەودا فراوانی تێگەیشتنی هەیە لە چاو هاوەڵە مرۆکانیدا

هەروەها بەدیهێنانەوەی تاقیکردنەوەکانی پێشتر دەتوانێت بیجولێنێت لە شیعردا.

دەمەوێ بە وتەیەکی باختین کۆتایی بەم نوسینە بهێنم کە دەڵێت؛ ئەگەر دەقێك لەئارادا نەبێت ئیتر بیر لە چی بکەینەوە و باسی چی بکەین؟ کەواتە دەق ئەو بابەتەیە کە خوێنەر دێنێتە قسە و لەسەر وەستان، ئەم نوسینەش رامانێکی کورتە لەسەر ئەم شیعرە و کە دەقەکە خۆی سەلماند تا بێتە بوون.

حوزەیرانی ٢٠٠٥

★ "پشوویەك یان"شیعری (شیرین.ك) ئەدەب و هونەری کوردستانی نوێ ژمارە (٤٣٦) رۆژی (٢٠٠٥/٥/١٢).



# گەڕان بەدوای شوناسدا

# لای ئاویزان نوری

قسەکردن لەسەر شیعر وەکو هیچ قسەکردنێکی تر نییە لەسەر ژانرە ئەدەبیەکان، هەرچی چیرۆك و رۆمانە هێڵێکی ستونی یان شاولی هەیە کە خوێنەر، یان رەخنەگر دەتوانێ کارێکی لەسەر بکات و بە زۆرێك لە لایەنە پەنهانیەکانی ئاشنا بێت، بەڵام لە شیعردا تەمومژێکی زۆرتر دێتە رێی خوێنەر، ئەمەش لەوێوە سەرچاوەی گرتووە کە شیعر زیاتر رۆحێکی ئیستاتیکی تێدا زاڵە و جوانیەکی سیحر ئامێزی پێبەخشیوە، بەمانایەکی تر شیعر دەرککردنێکی ئێستایانەی تێدایە بۆ ژیان کە وادەکات خوێنەر لەگەڵ خۆیدا تا دوا دێڕەکان پەلکێش بکات و بەرەو خەیاڵێکی سۆزئامێزانەی ببات، بێگومان من قسەم لەسەر ئەو شیعرانەیە کە هەڵگری

بەهاکانی شیعریەتن و پڕن لە ئیستاتیکا و فەنتانزیا و پرسیار وروژێنەرن بۆیە کاتێك دێین و دەمانەوێ قسە لەسەر شیعر بکەین دەبێ وشیارانە مامەڵە لەگەڵ شیعر بکەین بە چاوێکی جیا لە ژانرە ئەدەبیەکانیتر لێی بڕوانین و خەیاڵمان لەئاست دەربڕینەکانی شیعردا زۆر فراوانتر بێت.

دەکرێت لەم سەرەتایەوە قسە لەسەر دیوانە شیعرێکی(ئاوێزان نوری) بکەین لەژێر ناونیشانی(پیاسەیەك بە کوچەکانی قەدەردا)، ئاوێزان یەکێکە لەو شاعیرانەی لەدوای رزگارکردنی کەرکوکەوە من وەکو شاعیرێکی ژن ئاشنای بەرهەمەکانی بووم و لە زۆرێك لە بلاوکراوەکانی کوردستاندا شیعرەکانی بلاوکردۆتەوە و ئەم شیعرانەش ئەگەرچی زۆرێکیان بەرواری نوسینیان پێوە نیە، بەلام پێموایە زۆرێکیان پاش رزگارکردنی کەرکوك نوسرابن. لەم نوسینەدا هەوڵدەدەم خوێندنەوەیەکی گشتی بۆ چەند دەقێکی نێو ئەم دیوانە بکەم.

شاعیر لەیەکەم شیعرەوە دەیەوێت شوناسی خۆی بۆ خوێنەر بخاتە روو، ئەو شوناسەی کە خۆی وەکو مێینە خاوەنی نەبووە و ئەوانی تر بڕیاردەری هەست و



نەستەکانیەتی(مەبەستم لە ئەوانی تر خێزان و کۆمەڵگەیە) بێگومان لە کۆمەڵگەی ئێمەدا کە کۆمەڵگەیەکی باوکسالاری نائازادە هەمیشە خێزان و کۆمەڵگە شوناسی مێینە دیاری دەکەن و ئەوان بڕیار لەسەر هەموو چالاکی و جموجۆڵە جۆرا و جۆرەکانی رەگەزی مێینە دەدەن شاعیر دەنوسێت؛

ئەو کەسەی بە وشکی تەڕیان کردوو بە تاوان شوشتیانەوە

ئەوە من بووم

ئەوکەسەی پێناسەی عومری دیار نەکراو..

ئەلبومی ئۆقرەیان سوتاند

ئەوە من بووم

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە هەمیشە بڕیارەکانی ژیان بەدەست خودی شاعیر نەبوون لەژیاندا(کەدەڵێم خودی شاعیر مەبەستم رەگەزی مێینەیە لە کۆمەڵگەی ئێمەدا، چونکە من شاعیر وەك نوێنەری دەنگی مێینە دەبینم) دواتر کە شاعیر باس لە ونبوونی پێناسەی عومری دەکات، ئەوە بە تەنیا ونبوونی تەمەنی ئەو نیە، ئەوە ونبوونی عومری سەدان کیژی کوردە کە بەدەست

خێزان و کۆمەڵگە و پێشتریش بەدەستی بەعس ونبوون تالەکۆتاییدا دەنوسێت:

بۆیە عومرم نغرۆ بووە و
مانەوەم بۆ هەڵوەرین دەسوتێ.

دواتر شاعیر دووبارە جەخت لەسەر نغرۆبوونی تەمەنی دەکات، کە پێموایە مەبەستی لە نغرۆبوونە لەو گێژاوەی کە کۆمەڵگەی ئێمە بۆ رەگەزی مێینە خوڵقاندوویەتی، هەروەها ئەو بوونەشی بە بوونێکی ئەکتیڤ نازانێ، چونکە پێیوایە بۆ هەڵوەرین دەسوتێ، هەڵوەرینیش سەفەرە بەرەو عەدەم، چونکە کچانی ئێمە لەگەڵ ئەوەی بەشێکی زۆری تەمەنیان لە گەورەیدا لە لێواری عەدەمدایە، بۆیە هەمیشە رەشبینن و ئایندە بە تاریکی دەبیبینن، ناچار دەیەوێ بگەڕێتەوە بۆ منداڵی و لەگەڵ خەونەکانی منداڵیدا پەرە بە ژیان بدات.

تەمەنی منداڵی ئەو تەمەنەیە کە مرۆڤ بناغەی کەسایەتی خۆی دادەنێت و لەوێوە بە جیهان و دەوروبەر ئاشنا دەبێت. لەلایەکی ترەوە پێموایە منداڵ ئازادترین بونەوەری سەرزەوییە، چونکە ئەوەی لە دڵیدایە و بەخەیاڵیدا دێت بێ سانسۆر دەری دەبڕێت، گەڕانەوە بۆ منداڵی خەونی شاعیرە و ئەو دەیەوێ هەمیشە لە



منداڵیدا ژیان بگوزەرێنێ، چونکە منداڵ دوورە لە چاوە بەگومانەکانی کۆمەڵگەی نەریتی و لە منداڵیدا کۆمەڵگە وەکو پەرییەك لەکچ دەڕوانن کە پڕیەتی لە بەرائەت وەکو خۆی دەڵێت:

لەیادمە کە منداڵ بووم، پەرییەك بووم، تاحەوت
جەژن
شەم جورئەتی لێ دەڕژا لە هاتنەدنیام بە ڕووتی
تەمەن لە پەیژەکانی زەمەن سەرکەوت و..
شەمیش پڕبوو لە بەرائەت.

رەنگە ئەم گەڕانەوەیەی شاعیر بۆ منداڵی لەوەوە سەرچاوەی گرتبێ کە منداڵ ئازادترە لە کۆمەڵگەی ئێمەدا، چونکە لەگەڵ هەڵکشانی تەمەندا ئازادییەکانی منداڵ سنوردار دەکرێن، واتە دەتوانین بڵێین گەڕانەوە بۆ منداڵی، گەڕانەوەیە بۆ زەمەنی ئازادی.ئازادییەك کە لە مێینەکانی کۆمەڵگەی ئێمە زەوتکراوە.

دواتر شاعیر جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە لەگەڵ هەڵکشانی تەمەنیدا هەموو بەهاکانی ئازادی و منداڵی لێ ونبووە و ناتوانێ لە فیردەوسەکانی خودادا یاری بکات و مومارەسەی ژیان بکات، لەکۆتاییدا شاعیر دەڵێت:

ئەمێستا من

هەرخۆم تەنیا

تەنیا لەگەڵ سێبەرەکەم

سێبەرەکەشم رۆحی منە و ..

بەدیار شیوەنەکانی شەم هێدی..هێدی دەتوێتەوە.

تەنیایی رۆحی شاعیر دەکوژێ و بەرەو فەنابوونی دەبات، فەنابوونێك کە بەدیار فرمێسکەوە دەتوێتەوە. لێرەدا شیعر هەڵچوونی عەفەویانەی هەستە بەهێزەکانە و بنەمای خۆیلە سۆزێکی وەبیرهێنراوەی ساتەکانی هێورییەوە وەردەگرێت ئەو سۆزەی کە لێی رادەمێنرێت وەکو جۆرێك لە کاردانەوە وایە هێوری وردە وردە ون دەبێت و سۆزێك کە هەمان سروشتی ئەو هێورییەی هەیە دەردەکەوێت لە کاتێکدا کە هێشتا بوبێت بە بابەتی تێڕامان، ئەو سۆزە ئێستا لە کارێکی بەردەوامدا بەرهەمدەهێنرێت و لە راستیشدا لە مێشکدا خۆی فۆرمەلە دەکات. پاش خوێندنەوە سەرجەم تێکستەکانی ئەم دیوانە هەستێکی زۆری گومان و نائومێدی دەبینین کە ئەم گومان و نائومێدیانە بەدەرنین لەو نائومێدیانەی کچانی کورد و ئەم شیعرانە هەڵگری خەمی نەوەیەکە کە لە دنیایەکە بێسنور و ئازاددا ئەوان کۆتی کۆمەڵگە لەقاچیاندایە. لە دواجاریشدا شاعیر لە پلەدا جیاوازە و لە



هەمان جۆری مرۆڤیترنیین، شاعیر هەستیارییەکی ئێجگار زیندووی هەیە زۆر حەماسی و سۆزدارە و زانیارییەك چڕی هەیە لە بارەی سروشتی مرۆڤەوە گیانێکی مەودا فراوانی تێگەیشتنی هەیە لە چاو هاوەڵە مرۆکانیدا هەروەها بەدیهێنانەوەی تاقیکردنەوەکانی پێشتر دەتوانێت بیجوڵێنێت لە شیعردا.

*نامیلکەی (پیاسەیەك بە کوچەکانی قەدەردا)، ئاوێزان نوری- لەبڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوکردنەوە-ساڵی(٢٠٠٥).

# گومان و ونبوونی شوناس

## لە شیعری (کچێك بە سادەیی ئەدوێ)

شیعر هەرچیەك بێت بەدەرنییە لە هەست و سۆزەکانی شاعیر و هەڵچوونی چرکەساتی شیعری. سۆزان بیرنار پێیوایە شیعر دوو جۆر حەقیقەت لە خۆدەگرێ، حەقیقەتێکی تایبەتی و سەربەخۆ و حەقیقەتێك کە پەیوەندی بە کەسێتی نووسەرەکەوە هەیە، لەوکاتەشدا کە کە حەقیقەتی شیعری دەبێتە کریستاڵبوونێکی شیعری و یەکەیەکی رێکخراو و ژیانەوەیەکی دووجایە بۆ ئەو شتەی کە لە ناخی نووسەرەکەیدا پەنگیخواردۆتەوە. منیش لەگەڵ هەمان رادام پێموایە شیعر ئەو ژانرەیە کە زۆرترین نهێنیەکانی ناخی مرۆڤی لە سینەیدا هەڵگرتووە و هیچ ژانرێکی ئەدەبی هێندەی شیعر بۆ مرۆڤ کاریگەر نەبووە و رێگەیەکی تارادەکیش ئاسان بووە و زۆر کەس



دەستیان پێیگەیشتووە کە ئەمە لە چیرۆك و رۆماندا بەدیناکرێت، چونکە ئەم دوو ژانرە ژانری سەردەمی شارستانی و نوخبەوین. لەلایەکیترەوە دەبێ ئاماژەش بەوە بدەین کە هەموو نوسینێك نابێتە دەق تا پەیوەندییەکی پتەو لەگەڵ خوێنەردا دروست نەکات، هەمیشە بڕیاردەر لەسەر بەدەقبوونی نوسینێك خوێنەر دەیدات و لێرەشەوە دەکرێیت بڵێین ئەگەرچی نوسین کارێکی فەردیە، بەڵام لەگەڵ بڵاوبونەوەی دەقدا لە کاری فەردانی دەردەچێت و دەبێتە کارێکی دەستە جەمعی، دەستە جەمعی بەو واتایەی چیدی نوسەر ناتوانێ راڤەیەك بەسەر خوێنەری دەقدا بسەپێنی، بەڵکو ئەوە خوێنەرە خوێندنەوە و راڤەی جیا جیا دەداتە دەق، بۆیە هەمیشە دەقە سەرکەوتووەکان، یان راستتر بڵێم ئەو نوسینانەی بوونەتە دەق زۆرترین راڤە هەڵدەگرن و خاوەنی فرە رەهەندترین مانان.

دەکرێت لەم سەرەتایەوە قسە لەسەر شیعری (کچێك بە سادەیی ئەدوێ)ی (بەهار مەحمود)ی شاعیر بکەین، ئەم شیعرە یەکێك بووە لەو دەقانەی پاش خوێندنەوەی رایوەستاندم و پرسیاری جۆراوجۆری لەلاوروژاندم پرسیار لەمەڕ گومان و بێشوناسی کچی کورد و بیهودەیی و

..هتد یەکێك لە جوانیەکانی دەق وروژاندنی پرسیار لەبیری خوێنەردا، چونکە پێموایە هەموو دەقێك گەر زیندوو بێت (زیندوێتی بەو مانایەی هەلگری بەهای دەقبوونە) دەبی پاش خوێندنەوەی پرسیار بوروژێنێت.
ئەگەر لە ناونیشانی ئەم شیعرە رابمێنین (کچێك بە سادەیی ئەدویّ) سەرەتا دەبی بزانین چی ئەم کچەی هێناوەتە دواندن، یان ئەو فەزایە چییە کە ئەم کچە هەولّ دەدات تیایدا بدویّ؟ مرۆڤ بۆیە ئەدویّ تا گوزارشت لە بوونی خۆی بکات و پەیامێك بەگوێی ئەویتر (بەرامبەر) دا بدات، ئیتر رەنگە پەیامەکە پەیامێکی داواکاریانە بێت، یان پاڕانەوەیە، یان پرسیارکردنە لە ماهیەتی دیاردەیەك، یان...یان، ئەمە تەنها لە ناونیشاندا دەمانخاتە بەردەم چەند دید و تێڕوانینێکیتر.
ئەگەر بە وردی لە دەلالەت و ئاماژەکانی ئەم شیعرە بکۆڵینەوە دەبینین دوو چەمك زۆر بالادەستن لەم شیعرەدا کە ئەوانیش چەمکی (گومان و شوناس)ن شاعیر لە سەرەتای شیعرەکەوە دەیەویّ بە شوناسێکی کچانەوە بدویّ و ناسنامەی کچێنی خۆی بنوسێتەوە و دەنوسێت؛

من کچێکم لە نووسینەوەی ئاو..



لە تێپەڕبوونی دەریا

دواتر شاعیر کە هەست بە ونبوونی کچێتی خۆی دەکات خۆی وەکو ژنێك دەناسێنێتەوە ئەمە بەڕای من حاڵەتێکی سایکۆلۆژی تایبەتی شاعیرە رەنگە لە بێئاگاییەوە ئەم دەقە هاتبێتە بوون، بەلاّم ئەگەر لە ئاگایشدا بێت ئاساییە، چونکە هەمیشە لە کۆمەلگە نەریتیەکانی وەکو کۆمەلگەی کوردی و هاوشێوەکانی مێینە بێشوناسە زۆرجار لە تەمەنێکی کەمدا دەبیستین بە کچێك دەوترێت تۆ هێندەی ژنێك دەبیت، یان ئەگەر ئەو کچە مەیلێکی منداڵانەی هەبێت پێی دەڵێن؛ خۆ تۆ هێندەی ژنێکی کاری منداڵانە مەکە، بۆیە زۆرجار قۆناغێك لە تەمەنی مێینە لەم جۆرە کۆمەلگایانەدا ون دەبێت لە منداڵیەوە بەرەو ژن بوون، شاعیر دەنوسێت؛

من ژنێکم حەرفەکانم گومانە و
دێڕەکانم سواو
گوێیەکانیش لە ئاستمدا
هیچ نابیستن

لێرەدا گوزارشت لەو حاڵەتە کراوە کە گویّ لە مێینە ناگیرێت و هەرچیش بڵێن گوێیەکانی ئەویتر لەئاستیدا هیچ نابیستیّ، بێگومان لێرەدا مەبەستم لە (ئەویتر) لە

خێزان و کۆمەڵگە و هەتا هاوڕێ و خوشك و براشە، شاعیر بە درێژایی ئەم دەقە جەخت لەسەر ونبوونی شوناسی خۆی دەکات و گومان لە ژیان و لە هەموو دەورووبەری دەکات، هەتا دەتوانین بڵێین کە دەق لەنێو تەمی گوماندا نغرۆ بووە و ئەو تەمە هەموو دەقەکەی گرتۆتەوە هەتا گومان لە خودی خۆی دەکات و خۆیشی ناناسێتەوە، بەڵام دەبێ بپرسین چی وا لە مرۆڤ دەکات خۆی نەناسێتەوە، لە روانگەی سایکۆلۆژیەوە کاتێك مرۆڤێك خۆی هەست بە ئاڵۆزیەکی دەروونی زۆر بکات ئەو ساتانە هیچی لەبیر نامێنێت، ئەم لەبیر نەمانە سەرەتای ونبوونی خودە، شاعیر بەم شێوەیە گوزارشتی لێکردووە؛

هەرچی دەکەم کچێتیم ناناسمەوە
لە چ کۆڵۆنێکی یەئسا، جێمهێشتووە
ئای چەندە گومڕام لە ناسینەوەی خودی خۆم

پیشتر قسەمان لەسەر بوونی گومان و بێشوناسی و هەتا ونبوونی خودی شاعیریش کرد، بەڵام لەگەڵ وردبوونەوەی زیاتردا لە دەق بینین ئەم کاریگەریانە خۆکرد نین، بەڵکو ئەوە تارماییە ترسناکەکانی خێزان ئەم گومان و ترسەیان دروستکردووە و بوونەتە خۆرەی دڵی شاعیر و نەیتوانیوە



لەژێر ئەم تارماییەدا بێتە دەرەوە، بۆیە هەرخۆشی بە راشکاوانە دەڵێت؛

من ژنێکم پڕم لە منداڵی خۆم و
پڕم لە سەرکێشیەکانی باوکم و
پڕم لە ترسنۆکیەکانی دایکم.

لێرەشدا دیسان شاعیر باس لە کچێتی و تەمەنی کچێنی خۆی ناکات بۆیە من لێرەدا دەمەوێ ئەوە بڵێم کە شاعیر توانیویەتی گوزارشتێکی جوان لە ژیانی ئەو هەزاران کچە ئەنفالە بکات کە کچێنیان بە دەستی سەرانی عەرەب ونبوو و خۆیشیان نازانن چۆن و لەکوێ لە چ زیندانێکدا فەنا بوو، یان ئەو سەدان کچەی هەموو تەمەنی لاویان لە چوار دیواری ماڵەوەدا ونبووە. هەر لەو کۆپلەی سەرەوەدا شاعیر باس لە سەرکێشیەکانی باوکی و ترسنۆکیەکانی دایکی دەکات، ئەمەش گوزارشتە لەو حاڵەتە باوکسالاریەی نێو کۆمەڵگەی ئێمە و هاوشێوەکانی.

دەمەوێ دیسان بگەڕێمەوە بۆ ناونیشان کە شاعیر دەڵێت بە سادەیی دەدوێم هەر ئەمە لە کۆتایی شیعرەکەدا تەئکید دەکاتەوە. دەبێ سەرەتا بپرسین مرۆڤ بۆ بە سادەیی دەدوێ؟ هەموو دەزانین کاتێك مرۆڤێك دەیەوێ بە سادەیی بدوێ واتە دەیەوێ هەموو کەس، یان زۆرترین

کەس تێیبگات ئەمەش دیسان لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە کەس گوێ لە شاعیر ناگرێ بۆیە ناچار دەبێ زۆر بە سادەیی بدوێ تا ئەوەی لە ناخیدایە و دەیەوێ گوزارشتی لێبکات بە سادەیی بیدرکێنێ.

دواجار دەتوانین بڵێین شاعیران پتر لە خەڵکی ئاسایی، قوڵتر هەست بە دەور و بەری خۆیان دەکەن، هەربۆیەش خۆیان سەغڵەت دەکەن و هەوڵ دەدەن بە شێوەیەك هەست و نەستی خۆیان دەربڕن کە هەموو کەسێك بۆی هەبێ بەشداریان بکات و تێیانبگات.

فروغی فەروغزاد جیا لەهەموو شاعیرەکانی تری دنیا بۆچونێکی جوانتر و جیاتری هەیە لەسەر شیعر و شاعیر بوون، ئەو پێی وایە شاعیر بوون جۆرێکە لە پارێزگاریکردن لە ژیان و خود و جەنگێکە بۆ بەرپەرچدانەوەی مەرگ، لەم بارەیەوە دەڵێت؛من ناتوانم ئەوە روون بکەمەوە کە بۆچی شیعر دەنووسم. من وای بۆ دەچم هەموو ئەوانەی کە کاری هونەری دەکەن هۆکەی ، یان لانی کەم یەکێك لە هۆکان جۆرە پێداویستیەکی‌نەستیانە (لاشعوریانە)یە بۆ رووبەڕوو بوونەوە و وەستانەوە دژ بە نەمان، ئەمانە مرۆڤگەلێکن کە ژیانیان زیاتر خۆشدەوێت و لێی تێدەگەن. دواتر لە



مەڕ شیعر دەڵێت؛ شیعر بۆ من وەکو هاوڕێیەکە کاتێك پێی دەگەم دەتوانم بە ئیسراحەتی خۆم دەردی دڵی خۆمی بۆ هەڵڕێژم، بەشەکەی ترمە کە کامڵم دەکات، رازیم دەکات بێ ئەوەی ئازارم بدات. پێموایە لەم دەقەدا هەردوو حاڵەتەکە دەنگدانەوەی بەچاوی هەیە. شاعیر لە نائاگاییدا لە دەرگای زۆر باس و مەسەلەی هەستیاری کۆمەڵگەی کوردی داوە، ئەم شیعرە بەدەر لەوەی هەستێکی فەردانی شاعیرە، لە هەمانکاتدا کارکردنە لەسەر کۆمەڵگە و دەوروبەر و تیشکخستنە سەر ئەو دیاردە کۆمەڵایەتیانەی کۆمەڵگەی کوردی.

*کچێك بەسادەیی ئەدوێ، شیعری بەهار مەحمود، ئەدەب و هونەری کوردستانی نوێ ژمارە (٤٤٣)ی رۆژی (٢٠٠٥/٦/٣٠).

# بەشی چوارەم

# ژن و ژیان

ئـــەو وتارانـــەی لـــەم بەشـــەدایە خوێندنـەوەی ئـەو کتێبانەیـە کـە لـە رەوشـی ئێـستای ژیـانی ژنـی کـورد دەدوێـن و دەیانـەوێت ژیـانی ژنـی کـورد لـەو چەقبەسـتووییە رزگـار بکەن.

# شەرەفنامە

# هەوڵێك بۆ پێناسەكردنەوەی

# چەمكە حەرامەكانی

# كۆمەڵگەی كوردی



پاش راپەرین دۆزی ژنی كورد گۆڕانكارییەكی زۆری بەخۆیەوە بینی هەم لەڕووی چۆنایەتی و هەم لەڕووی چەندایەتیشەوە. بەر لە راپەڕین ژنی كورد خاوەنی رێكخراوێكی سەربەخۆ و تەنانەت یانەیەكی بەرگریكاریش نەبووە لە مافەكانی، بەڵام هەنووكە دەیان رێكخراوی حزبی و حكومی و سەربەخۆ بۆ داكۆكیكردن لە مافەكانی ژنان هاتونەتە بوون، هەروەها ژنان خاوەنی چەندین رۆژنامە و گۆڤاری تایبەتن و لەوێوە رازەكانی خۆیان دەردەبڕن و لە زۆرێك لە رۆژنامە حزبی و حكومی‌یەكاندا خاوەنی لاپەڕەی تایبەت و تەوەرەی تایبەت بە ژنان و ئەمەش گرنگییەكی تری بەرەو پێش چوونی دۆزی ژنی كوردە، هەر پاش راپەڕین سەدان ژن هاتنە زۆرێك لە كایەكانی تری ژیانەوە و شان بە شانی رەگەزی بەردەم كەوتنە دەرخستن و بڕەودان بە تواناكانیان. لێرەوە ژنی كورد هیچ نەبێ توانی پەنجە لەسەر زامەكانی خۆی دابنێ و بەرامبەر رەگەزی بەرامبەر بڵێ(نا) كە بەڕای من ئەم(نا)یە سەرەتای ریفۆرمێكی كۆمەڵایەتی گرنگە.

دەكرێ لەم سەرەتایەوە قسە لەسەر یەكێك لەو كتێبانە بكەین كە(نا)یەكی تری ژنی كوردە دژی دەسەڵاتی

کۆمەڵگە وئایین و خێزانسالاری ئەو کتێبەش(شەرەفنامە)یە کە لێکۆڵینەیەکی چڕوپڕی لەسەر کێشە هەنوکەییەکانی ژنی کورد کە خاتوو(مهاباد قەرەداغی) نوسیویەتی و لەم کتێبەدا هەوڵی سڕینەوەی ئەو ئاسەوارانە دەدات کە (شەرەف وەکو کۆدێك بۆ کۆیلە کردنی ژن) بەکاردێنێت و مەهاباد دەیەوێ پێناسەیەکی نوێ بۆ چەمکی شەرەف بهێنێتە نێو عەقڵی مرۆڤی کورد و چیتر شەرەف نەکرێتە ئەو شمشێرە خوێناویەی جەستەی ژنی پێزامدار بکرێ. کتێبەکە لە دە بەش پێکهاتووە و لەم نوسینەدا هەوڵ دەدەم تیشك بخەمە سەر چەند لایەنێکی گرنگی ئەم کتێبە. سەرەتا نوسەر لەمەڕ ناوی کتێبەکەی دەنوسێت؛ ئەم کتێبەش ناوی شەرەفنامەیە، بەڵام هیچ پەیوەندیەکی دوور و نزیکی نە بە شەرەفخان و نە بە شەرەفنامەکەی ئەوەوە هەیە. لەم کتێبەدا شەرەفنامە ئاماژەیە بەو پەیامە ترسناکەی کە لە چەمکی شەرەفدا جێگەی بۆتەوە و کراوەتەوە پێوەرێك بۆ رەوشت و، نۆرمێك بۆ کۆمەڵگە و، زیندانێك بۆ ژن. چونکە چەمکی شەرەف لە کلتووری باوکسالاری و، بەتایبەت لە کلتورەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا یەك ئیماژی هەیە، ئەویش جەستەی ژنە، بە شەرەفیی و



بێشەرەفی تەنها و تەنها پەیوەستن بە چۆنێتی جموجوڵی ژنەوە سێکسوالێتی ژن بڕیاردەرە لە رێژە و رادەی بەشەرەفی پیاوانی بنەماڵە و خێڵ، کە کۆی ئەمانەش کۆمەڵگەکەی پێك دەهێنێت.

دواتر لە مەڕ ستراتیژی کارکردنی خۆی لەم کتێبەدا دەنوسێت؛ بۆچوونی من و هەوڵ و تەقەلاکانی من تەنها بۆ ئەوە نییە لە دیاردەی شەرەف بکۆڵمەوە و، بزانم هۆکارە کۆمەڵایەت و ئابوری و سیاسیەکانی چین، بەڵکە ئەوەشە کە بە یاریدەی پێوەری زانستیەکان، بەتایبەتی زانستە مرۆییەکان، بتوانم پسپۆڕانە لە پێناسەکردنەوەی چەمکی شەرەفدا بەشدار بم و، بتوانم شەرەف لەو پێناسە باو و سەپاوەی بهێنمە دەرەوە کە وەك کۆدێك بۆ کۆیلەکردنی ژن کاری پێکراوە.

لێرەدا دەگەینە ئەو رایەی کارکردنی (مهاباد) لەپێناو سەلماندنی راستییەکاندا وەکو خۆیان نەك دەستکاریکردنی راستییەکان و بەکاربردنیان بەئارەزووی ئەو کەس و لایەن و حزبانەی دەیانەوێ مەرامی خۆیان بهێننە دی. لەبەشی یەکەمدا نوسەر دەیەوێ ئەوە بسەلمێنێ کە راستە جیاوازی لەنێوان هەردوو رەگەزدا هەیە، بەڵام ناکرێ و نابێت ئەم جیاوازیانە لە بەرژەوەندی لایەك بەرامبەر

لایەکی تر بەکاربهێنرێ، بەڵکە نۆرم و نرخاندنی کلتورەکان هاتوون خاڵە جیاوازەکانیان لە بەرژەوەندی لایەك لێکداوەتەوە و کردویانە بە مایەی دابەزاندنی پێگە و لاوازکردنی کەسایەتی لایەکی دیکە. لەم لێکۆڵینەوەدا دیاردەی رەوشت و کاریگەری رەوشت لە کلتورەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا و ئەو نۆرم و نرخاندنانەی کە لەسەر بنچینەی تێگەیشتن لە رەوشت دانراون و کاریگەری هەموو ئەمانەش لەسەر کەسایەتی ژنی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بۆیە کاریگەری بیئەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست (بێگومان بیئە مەبەست لە کۆمەڵگە و خێزانە هەموو کارتێکەرەکاتی ترە) کاریگەریەکی راستەوخۆی لەسەر رەوشی ژیانی ژن هەیە، ئەم کاریگەیانە تا رادەیەکی زۆر نێگەتیڤانە شکاوەتەوە لەدژی ژن بوون، بۆیە کاتێك پێناسەی چەمکی رەوشت دەکرێت لە کۆمەڵگە نائازادەکاندا دەگەینەوە ئەو رایەی کە چەمکی رەوشت بۆخۆی وەك هەر چەمکێکی تر و دیاردەیەکی تری ناو کۆمەڵگە، خۆی بێلایەنە، مرۆڤ لایەنێك، رێرەوێك و یاسایەکی بۆ دادەڕێژێ و لە بۆتەی ئەوانەدا لەناو پێناسەیەکی تایبەتیدا بەندی دەکات. چەمکی رەوشت لەناو هەموو چەمکە کۆمەڵایەتیەکانی تردا لە کۆمەڵگە



نەریتیەکاندا، هەستیارترین چەمکە و، لەناو تاقە پێناسەیەکی بەرتەنگدا بەند کراوە و قوفڵ دراوە. ئەو پێناسەیەش بەستراوە بە جەستەی ژنەوە، بە سێکس و پەیوەندییەکانی ژن و پیاوی ئەو کۆمەڵگانەوە. بۆیە گرنگە لەم پێناسەیەوە وەژوور بکەوین بە تونێلە تاریکەکانی ئەو کلتورەدا لە دووی ئەو هۆکارانە بگەڕێین کە بوونەتە سۆنگەی رەنگڕێژکردنی چەمکی رەوشت بەرەنگی تاریك و لەئاکامیشدا ژنانی ئەو دەڤەرەیان لەناو تاریکی ئەم چەمکەدا گیر کردووە، زەبر و زەنگی رەوشت لەگەڵ گۆڕانکاریە زۆر و خێراکانی کە بەسەر مێژووی مرۆڤدا هات بەتایبەتی ئەو گۆڕانکاریە مەزنانەی لەسەر بنەمای ئابوری بەشێك لە وڵاتانی دنیادا، لەم چەند سەدەیەی دواییدا روویدا، بووە هۆی گۆڕانکاری مەزن لە بیر و هۆش و ئاوەزی خەڵکی ئەو وڵاتانەش کە گۆڕانکاریەکانیان تیدا رووی داوە.

بەشێکی تر لەو کاریگەریانەی کە زۆر بەروونی کاریگەری لەسەر ژن هەبووە (ئایین)ە، ئایین لە زۆربەی وڵاتەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کراوە بە بڕبڕەی پشتی دەسەڵاتی سیاسی و، دەسەڵاتە سیاسیەکانیش لە لوتکەی دڕندایەتی و دیکتاتۆریدا خۆیان نواندووە. لەو دەڤەرەدا

کە هەر لە سەرەتاوە نیوەی کۆمەڵگەکەی ئیفلیج کراوە بەهۆی ئەو دەسەڵاتە کە ڕەوشت سەپاندوویەتی، نیوەکەی تری کۆمەڵگەش بەهۆی ڕەوشتی ئەو دەسەڵاتانەوە کە وڵاتەکان بەڕێوەی دەبەن، کەسایەتیان تا ڕادەیەکی زۆر و بە زەبری زەبروزەنگ و کوشت و بڕ، لەتوانا و بەرهەڵستی خاڵی دەکرێنەوە. هۆی ئەوەیە گۆڕان لەو دەڤەرەدا خاو دەڕوات، بەتایبەتی لە بواری هۆش و فیکردا. لەبارەی دیاردەی ڕەوشت و تێڕوانین بۆ ڕەوشت، وەك گۆمێکی وەستاو، هەزار ساڵێکە گۆڕانی ئەوتۆی کە شایانی باس بێت بەسەردا نەهاتووە.

بێگومان دەسەڵاتی بەعسیش لەژێر پەردەی ئاییندا زەبرێکی کاریگەری لە ژن وەشاند و گاریگەریەکانی تا ناوەڕاستی ئەم سەدەیە بەردەوامی دەبێت، چونکە ڕەوشتی ئەم دەسەڵاتە کە دوایین دەسەڵاتی عیراق بوو (٣٥) ساڵی ڕەبەق کلتورە زەبر و زەنگی لە عێراق (داگیرکەری باشوری کوردستان) پیادە کرد، ڕەوشتێکی لە خراپەکاریدا لە پەسەن نەهاتووە سەبارەت بە هەموو دیاردەکان، بەرامبەر بە دیاردەی ژن و مەسەلەی ژن، نەك تەنها ڕەوشتێکی باوکسالارانەی نەریتی بوو، بەڵکە لەو بوارەشدا زێدەڕۆیی کردبوو.واتە ڕژێمی بەعس لەپێناوی پاراستنی



دەسەڵاتی خۆیدا، هەر لەسەرەتای حوکم بەدەستەوە گرتنی و بەشێوەیەکی سیستماتیك، برەوی بە سیستمی خێڵایەتی و گەشەدان بە ڕەوشتی باوکسالارانەی خێڵەکان دا. بەڵام نابێ چاوپۆشی لەوە بکەین کە پاش ڕاپەڕین دەروازەیەکی نوێ بەڕووی ژناندا کرایەوە بۆ زۆرێك لە بوارەکان، بەڵام ئەوەی کێشەی لەئاستی پێویستدا نەبێ خەمساردی ژنان و بەشبەشبوونی ڕێکخراوەکانی ژنان بوو، کە هەریەکەیان بەرژەوەندی حزبەکەی خۆی لەپێش بەدەستهێنانی مافەکانی خۆی دەبینییەوە.

بەشی دوومی ئەم کتێبە قسەکردنە لەسەر جەوهەری کێشەی کورد و کێشەی ژنی کورد، سەرەتا دەبێ ئەو ڕاستیە مێژوویە بزانین کە ئەوەی کێشەی ژنی کوردی زیاتر بەرەو ئاڵۆزی و بارگرژی زیاتر بردووە کێشەی کوردە، چونکە تا هەنوکە تاکی کورد بەدەست دەیان کێشەی سیاسی و جۆراو جۆرەوە دەناڵێنێ، کە هەموویان کاریگەری نێگەتیڤیان لەسەر کێشەی ژنی کورد هەبوو. نوسەریش لەو بارەیەوە دەنوسێت؛ مێژووی کورد و مێژووی ژنی کورد، دوانەیەکی دیلن، لە ڕابردوویەکی دوورەوە تا دوێنێش کە ڕابردووە و کاتێکی لەدەست چووە ئەو مێژووە بە دیلێتی تۆمار بووە و بواری سڕینەوەی

مەحاڵە، بەڵام لەمڕۆوە تا دواڕۆژێکی نزیك و دوور و هەموو ئەو ڕۆژ و ساڵانەی داهاتوومانداندان، ئەوانیش مێژوون، بەڵام مێژووییەکن هێشتا تۆمار نەبوون و بواری نەخشاندن و ڕەنگاندنی ئەو مێژووە بەدەستمانەوەیە، بە هەموو پێوەرێکی زانستی و لۆژیکی و هاوکێشە ئاوەزیەکان، ئازادکردنی دانەیەکی ئەم دوانەیە بێ ئەوی تریان وەك کارێکی ناتەواو و ناڕێك دەدات بە دەستەوە. مێژووی ژنی کورد ناتوانێ بە تەنها ئازاد بێ، کە ژن بەشێك بێت لە نەتەوەیەکی دیل و وابەستە. مێژووی کورد ناتوانێ بە تەنها ئازاد بێ، کە مێژووی نەتەوەیەك بێت نیوەی کۆمەڵگەکەی دیل و چەوساوەبێت.

بەشی دواتر تەرخانە بۆ قسەکردن لەسەر بەشداری ژن لەکاری سیاسیدا و ڕوانینی کۆمەڵگەی ئێمە بۆ کاری سیاسی ژن. یەکێك لەو خاڵانەی لە کۆمەڵگەی ئێمەدا بۆتە مشەخۆر و جیاکردنەوە و دابەشکردنی کۆمەڵگەیە بۆ دوو نیوە کۆمەڵگەی ناتەواو کە ئەوانیش (کۆمەڵگەی پیاو) و (کۆمەڵگەی ژن)ە. کە لێرەوە جەهەنەمێك لە جیاوازی لەنێوان هەردوو ڕەگەزدا دروست دەبێت، کە ئەم جیاوازیانە دەبنە هەوێنی کۆمەڵگەیەکی خێزانسالار. لەم دوو نیوە کۆمەڵگە ناتەواوەدا بەبێ چەند و چوون هەر



ژن و پیاوێك ئەو ئەرکانە ڕادەپەڕێنن کە لە سەری سەرەوە سیستمێکە نادادپەروەر و کۆنەخواز، لەسەر بناغەی بێمافکردن و خەساندن و نایەکسانی و هتد. ڕۆڵەکانی دابەشکردووە. ئەندامەکانی ئەم دوو نیوە کۆمەڵگەیە نەك پێکەوە و هاوشانی یەکتر. نەك هەردووکیان هاوتەریبی یەکتر، بەڵکە هەریەك بە جیا و بەشێوەیەکی ناڕێك و پێك و زیکزاك، بەبێ هەبوونی هیچ ئامانجێك بۆ گەشەسەندنی کۆمەڵگە هەنگاو دەنێن، هەریەك لە بواری جیاوازی خۆی تایبەتمەندێتی دەدرێتێ و لە کۆمەڵگەی ژناندا، ژنان دەبن بە پسپۆڕی کارە تایبەتیەکان، بواری خزمەتکردنی ماڵ و منداڵ و مێرد، لە کۆمەڵگەی پیاوانیشدا پیاوان دەبنە پسپۆڕی کارە گشتیەکان، بواری سیاسەت و ئابووری و زانستی و هتد.

بۆیە لێرەوە پەیوەندییەکانی نێوان ئەم دوو نیوە کۆمەڵگەیە نائاساییبوون بەخۆیەوە دەبینێت، بەڵام ژن تاڕادەیەکی باش دەستی گەیشتووە بە لایەنەکانی تر و بەشداریەکی مامناوەندی زۆرێك لە کایەکانی ژیانی کۆمەڵدا دەکات، بەڵام لە کایەی سیاسیدا تا هەنووکە ژنی کورد، نەك نەیتوانیوە پێی بگات، بەڵکو لەلایەن پیاوانیشەوە پەراوێز خراون و ڕێگیرییان کراوە، بەڵام

بەشێوەیەکی ئاسایی، سیاسەت ئەرکێکی بێلایەنە
(نیوترالّە)، ژن و پیاو دەتوانن ئەم رۆڵە وازیکەن و
هەردووکیان وەك یەك لەبەردەم گریمانی سەرکەوتن، یان
سەرنەکەوتنیدا لە پیادەکردنی ئەو ئەرکەدا دەوەستن
بەڵام وەك نەریت، ئەرکی سیاسەت بە پیاو سپێردراوە و،
بێژەی وا باوە کە پیاوانی سیاسەتباز سەرکەوتووترن لە
ژنانی سیاسەتمەدار.ئەو ژنانەی کە گەیشتوونەتە پلەکانی
دەسەڵات لە کوردستاندا تەنها ئەوانەن کە ئەندامی
هەردوو حزبی دەسەڵاتدارن. لەبەرئەوەی هەردوو حزبی
دەسەڵاتدار خاوەنی پرۆژەی پێشکەوتنخوازانە و
دیموکراتیانە و مەدەنیانە نین، بایەخێکی ئەوتۆیان بۆ
ژنان و گەشەدان بە توانای ژنان و، بیرازی کۆمەڵایەتی
نیەیە، چۆنایەتی بیرکردنەوەی ژنانی سیاسەتبازی
ئەندامیشیان بەهەمان ئاراستەیە. ئەوەی لەگەڵ
بەرژەوەندی حزبەکەیدا وێك نەکەوێت، با بۆ ژن و پرسی
ژن جێی بایەخیش بێت، ئەمان گرنگی پێ نادەن، تەنها
لەکاتێکدا دەنگیان دەبیسترێت کە لە پرسی ژن بدوێن،
کاتێك فەرمان لە سەرەوەی حزبەوە درابێت ئەمانیش
وەك ئەندام بەبێ چەند و چوون جێبەجێی دەکەن.



لەبەشی دواتردا نوسەر تیشك دەخاتە سەر رۆڵی ئایین
لەسەر مەسەلەی ژن. بێگومان ئایین یەکێکە لەو
فاکتەرانەی کە بۆتە هۆی چەوساندنەوەی ژنان
بەتایبەتیش لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، چونکە رۆژهەڵاتی
ناوەڕاست شوێنی سەرهەڵدانی هەرسێ ئایینە
ئاسمانیەکەن. ئایینەکان بۆیە دەبنە هۆی چەوساندنەوەی
مرۆڤ، چونکە ئایین بەشێوەیەکی گشتی بریتیە لە
پەیڕەو و پرۆگرامێکی دیاریکرا و بۆ ئاراستەکردنی
کۆمەڵگە. لەم پەیڕەو و پرۆگرامەدا چۆنێتی ژیان بەمانا
فراوانەکەی دەستنیشان دەکرێت. هەر ئاینێکی دیاریکراو،
یەك جۆری دیاریکرا و لە باوەڕ پێشکەش بە کۆمەڵگە
دەکات و لەناو ئەم باوەڕەدا پێشوەخت ستایلی ژیان بۆ
مرۆڤەکانی ناو ئەو کۆمەڵگەیەدیاریکراوە، لەهەر
ئایینێکدا فەرهەنگێکی تایبەتی هەیە بۆ پێناسەکردنی
دیاردەکان. ئەو پێناسانەش رەهان نەك رێژەیی، بۆنمونە
چاك و خراپ، باوەڕدار و بێباوەڕ، لە ئایینندا وەك رەش و
سپی، پێناسە دەکرێن و پەیڕەوکارانی ئەو ئایینە
دیاریکراوە لەو پێناسانەوە دەڕواننە هەموو ئەو
دیاردانەی کە لە ژیاندا هەن، واتە سیستمی عەقڵی ئەو

کۆمەڵگەیەی کە پەیڕوکاری ئەو ئایینەن وا شێوە دەگرێ کە بە ڕەهایی (موتڵەق) بیربکەنەوە نەك بە ڕێژەیی.

کەواتە ئایین دەبێتە بناغەیەکی پان و بەرینی ئەو کۆمەڵگانە و، ژیان و گوزەران و داب و نەریت و نۆرم و نرخاندنەکانیان بۆ دیاریدەکات و ئەوانیش لەسەری دەڕۆن، ئایین دەبێتە ئەتەکێتێکی دیاریکراو بۆ خەڵك و، ئەوانیش بەپێی ئەو ئەتەکێتە دەجوڵێنەوە و چالاکی کۆمەلایەتی دەکەن.

هەروەها ئایین و پەیڕەوکەرانی ئایین لەناو زمانی ئەو کۆمەڵگانەدا ئامادەییەکی هەمیشەییان هەیە. بەو پێیەش کە زانستی زمانناسی سەلماندوویەتی و پەیوەندی زمانی بۆ بیرکردنەوەی مرۆڤەوە دۆزیوەتەوە، دەتوانین بڵێین کە ئایین ڕۆڵی کارا دەبینێت لە سیستمی بیرکردنەوەی مرۆڤەکانی ئەو کۆمەڵگانە و، بەپێی ئەو سیمبولانەش کە لە زمانەکاندا بەرامبەر بەدەستەواژەی ژن و پیاو دانراون و پێناسەکراون، ئایین ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت لە بنیاتنانی ئەو زەبر و زەنگەدا کە بەرامبەر مێینەی مرۆڤ دەکرێت و لە زماندا بەرجەستە دەبێت و، لە کۆمەڵگەدا پیادە دەکرێت. لەلایەکی ترەوە لە کۆمەڵگەی ئێمەدا ژن و جەستەی لە توندوتیژی زمان و کلتوری ئایینیدا زەبری



کوشندەیان بەرکەوتووە. دوورخستنەوەی دین لە دەوڵەت، لە سیاسەت و کۆمەڵگە و هێنانەوەی بۆناو ماڵەکان و پریڤاتیزەکردنی، زۆرێك لەو توندوتیژییە کەم دەکاتەوە کە ڕاستەوخۆ ئایین هۆکاری بووە.

بەشی پێنجەمی ئەم کتێبە تەرخانە بۆ قسەکردن لەسەر ڕۆڵ و کاریگەری لەسەر ژن لە بنیاتنانی کۆمەڵگەی سیڤیلدا، سەرەتا دەبێت بزانین کۆمەڵگە مرۆڤ بنیاتی دەنێ و هەموو یاسا و ڕێساکانیش مرۆڤەکان دایدەڕێژن بۆیە ئەگەر مرۆڤ خۆی خاوەنی ڕەوشتی دیموکراتی نەبێ ناتوانێت پەیڕەوی یاساکانی دیموکراتی بکات، زۆر سەختە مرۆڤێك هەموو تەمەنی لە سایەی نۆرم و نرخاندن و پەروەردەی نا دیموکراتیدا بەسەر بردبێت و لەپڕ بتوانێت ڕێساکانی دیموکراتی قبوڵ بکات و پەیڕەوی بکات. پەروەردەکردنی مرۆڤ و چەسپاندنی ڕەوشتی دیموکراتی لە تاکێکی کۆمەڵگەدا پێویستە لەقۆناغی سەرەتای تەمەنیەوە دەست پێبکات وەك پرۆسەیەکی ئاسایی بەڕێوە بچێت، لە خێزان و لە باخچەی ساوایان و لە قوتابخانە سەرەتاییەکاندا پلانی زانستی بۆ بنیاتنانی کەسایەتی سیفەت دیموکرات لە تاکەکانی کۆمەڵگە دابنرێت.

هەروەها مرۆڤ لە سێ دامەزراوەدا پەروەردە دەبێت و عەقڵی گەشە دەکات کە ئەوانیش دامەزراوەی (خێزان، خوێندنگە، کۆمەڵگە)ن، بەڵام کاتێ ئەم سێ دامەزراوە رۆڵێکی ئەکتیف ناگێڕن لە پەروەردەکردنی تاکدا ئەوا دواجار مرۆڤێکی تەندرووست و عەقڵیەتێکی دیموکرات نایەتە بوون، بێگومان کە کەسایەتی مرۆڤی کورد بە گشتی لە ئاستێکی باشدا نەبێت و خاوەنی عەقڵیەتێکی دیموکراتیك نەبێت ئەوا حاڵی ژنی کورد لە دۆخێکی باشتردا نابێت، چونکە ژنی کورد بەردەوام لەژێر زەبری دەسەڵاتی خێزانسالاریدایە و خێزان زۆرێك لە ئازادیە سروشتیەکانی زەوت کردووە.

بەشی شەشەم تەرخانە بۆ قسەکردن لەسەر ئەو خاڵانەی لە زمانی کوردیدا هەوڵی بچووککردنەوەی ژن دەدەن، بێگومان لە زمانی کوردیدا دەیان زاراوە و ئاماژەی جۆراو جۆر هەن کە هەموویان گوزارشتکەرن لە بچووککردنەوەی رۆڵی ژن لە کۆمەڵگە و خێزاندا و ئەو دیاردانەش کە بەردەوام لەلایەن پیاوانەوە پەیڕەو دەکرێن رۆژانە بەر چاوی تاکەکانی کۆمەڵگە دەکەوێت و بۆتە قسەو کرداری ئاسایی لەزمانی کوردیدا ژن کۆدی شەرەفە، بەپێی ئەوە جەستەی مرۆڤی مێینەی مرۆڤی گۆمەڵگەی



ئێمە دەبێت بە (شوێن)ێك بۆ پاراستنی ماناکانی شەرەف، واتە جەستە لە پێناسە ئاساییەکەی خۆی (کە دەبێت سەلمێنەری بەشە فیزیکیەکەی خودی مرۆڤ بێت و، لە جوڵەیەکی بەردەوامدا بێت بۆ داهێنان، لە پێناوی گەشەسەندنی ئەو خودە)، دوور دەکەوێتەوە و پێناسەیەکی تری نائاسایی دەدرێتێ و دەکرێت بە (شوێن بۆ شەرەف) شوێنێکی وەکو فریزەر کە خواردنی تێدا دەپارێزرێت، واتە جەستەی ژن دەکرێت بە شت، ئەو (شتەش) خاوەنی هەیە، کە هاوکات خاوەنی شەرەفەکەشە. نوسەر ئەم بچوککردنەوەی ژنە لە زمانی کوردیدا دەبەستێتەوە بە دیاردەی شەرەفەوە ئەو تێڕوانینە باو و هەڵەیەی کە کۆمەڵگەی ئێمە بۆ ژن هەیە کە دەبێ لێرەوە هەوڵی گۆڕینی ئەو کلتورە بدەین کە نیوەی کۆمەڵگە وەکو پاشکۆ سەیر دەکات، چونکە هیچ کلتورێك نەگۆڕ نیە، کۆدەکانی هیچ زمانێك کۆدی هەمیشەیی و جێگیر نین. بۆیە مرۆڤ دەتوانێت گەشبین بێت بە گۆڕانکاری لە دوارۆژدا، بەڵام هیچ گۆڕانکاریەك لە خۆیەوە دروست نابێت و، هێزێکیش نیە لە سەرووی مرۆڤ خۆیەوە تابتوانێ ئەم کێشەیەی بۆ چارەسەر بکات.

لە کۆمەڵگەی کوردیدا سەرلەبەری دیاردەکان پێویستە پێناسە بکرێنەوە ئەوەی پێویستە بەم ئەرکەش هەستێ روناکبیرانی کۆمەڵگەن، زانکۆ و دەزگا زانستییەکان، سیستمی پەروەردەیە، تاکەکانن، ژن خۆی ئەگەر کارا نەبێت لەم پێناسەکردنەوەیەدا، دووبارە پێناسەکان ئیماژی نالۆژیکی دەدەنێ، بۆیە رۆڵ و کاریگەری ژن خۆی لەم بوارەدا بڕیاردەرە لەوەی دوورە لە پێناسەکردنەوەی دیاردەکاندا ئەویش ئیماژی شایستە وەربگرێت. بە کورتی کلتوری کوردی پێویستی بە پرۆستڕۆیکایە، سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی کلتور بە دەستی ژن و پیاوی روناکبیر و پێشکەوتنخوازی کورد.

ژن دەتوانێ تێڕوانینی کۆمەڵگە (بە ژن و پیاوەوە) بەرامبەر بەخۆی بگۆڕێ. لەم پرۆسەیەدا پێویستە رۆڵی سەرەکی ژنان خۆیان بیبینن و، ئەرکی بۆ بکێشن، ئەمە کاتێك دەکرێ کە ژنان هۆشیاربن بەرامبەر بە ئەرك و مافی خۆیان و، بەو ئاراستەیە کاردەکەن کە دەیانەوێ تێڕوانینی چەوتی کۆمەڵگە بەرامبەر بە خۆیان راست بکەنەوە.

لەبەشی حەوتەمدا نووسەر مەسەلەی سێکس و کۆدە سامناکەکەی لە کۆمەڵگەی کوردیدا دەخاتەوە بەرباس.



سێکس لە کۆمەڵگەی نائازادەکانی وەکو کۆمەڵگەی کوردی دەیان گرێی دەروونی بۆ هەردوو رەگەز دروستکردووە و ئەمە ئەگەر لەڕووی دەروونییەوە لە کاریگەرییەکانی ئەم دیاردەیە بڕوانین، بەڵام ئەگەر لەم رووەوە سەیری ئەم دیاردەیە بکەین کە جەستەی ژن شەرەفی پیاوە و سندوقێکە دەبێ پیاو خاوەنی بێت ئەمە کۆدە سامناکەکەی سێکسە و لێرەوە دەیان دیاردەی وەکو کوشتن و لوتبڕین و خۆسوتاندن و تیرۆرکردن دەستپێدەکات.

سێکس تایبەتیترین چالاکی مرۆڤە و یەکێکیشە لەو رەمەکانەی کە دابینبوونیان بۆ مرۆڤ پێویستە. دابینبوون یان دابیننەبوونی رەمەکەکانی مرۆڤ هەریەکە و بەجۆرێ کاریگەری خۆی لەسەر مرۆڤ بەجێدەهێڵێ رەمەکەکانی برسێتی، تینوێتی و خەو دابینبوون و دابیننەبوونیان کاریگەری فیزیکی لەسەر جەستەی مرۆڤ بەجێدەهێڵێ و راستە دابین نەبوونی موتڵەقیان رەنگە ببێتە هۆی مردن. بەڵام رەمەکی سێکس، دابینبوون و دابیننەبوونی کاریگەری لەسەر باری دەروونی مرۆڤ بەجێدەهێڵێ، بەڵام دەبێتە هۆی شێواندنی پارسەنگی باری دەروونی مرۆڤ. لەگەڵ ئەوەی کە خەڵکی ئاسایی خاوەنی ئەو تێڕوانینە هەڵەن، بەڵام لەنێو نوسەران و رۆژنامەنوسان و

هونەرهەندانیشدا عەقڵیەتێکی سەلەفی هەیە و نائازادن و کە خاتوو مهاباد چەند نمونەیەکی هێناوەتەوە لەنێو توێژی رۆشنبیرانی ئێمەدا.

بەشی دواتر تەرخانە بۆ قسەکردن لەسەر بەکاڵاکردنی جەستەی ژن و لەم بەشەدا نوسەر دەیەوێ ئەو بسەلمێنێ جەستەی ژن شەرەفی پیاو نیيە و دەبێ ئەو جەستەیە ژن ببێتەوە بە خاوەنی چیتر وەکو کاڵا لە کۆمپانیاکانیاندا مامەڵەی پێنەکرێت، هەتا چەمکی شەرەف و ناموس ئەو پێناسە سامناکەی هەبێت کە ئێستا لە کۆمەڵگە نەریتیەکاندا باوە و هەتا ئەم چەمکە لە جەستەی ژندا کۆکرابێتەوە بە تایبەتی ئەندامی سێکسی ژن پێوەری بن دۆخی کارەساتئامێز لە ئارادا دەبێت لەو دۆخەدا جەستەی ژن بەهای سروشتی خۆی لەدەست دەدات و دەبێتە (شوێن)ێك (یەخچاڵ)ێك بۆ شەرەفی کەسانی دی، شەرەفیش لە مانا سروشتیيەکەی خودی دوور دەکەوێتەوە کە دەبێت پێوەری سیفەتە گرنگەکانی مرۆڤ بێت وەکو: راستگۆیی، دەستپاکی، مرۆڤدۆستی و هتد.

بەشەکانی دواتری ئەم کتێبە چەند چاوپێکەوتنێکی نوسەری لەخۆگرتووە کە زیاتر بۆچوونەکانی نوسەر لەسەر دیاردەکانی کۆمەڵگەی کوردی روون دەکەنەوە.



دواجار وشیارکردنەوەی مرۆڤی کورد لە دیاردەکانی نێوکۆمەڵگە ئەرکی سەرەکی نوسەرانە، بەڵام رێگەکانی گەیاندنی ئەم وشیارییە سەختە، بەڵام لەوە سەختتر بێدەنگبوونە لەو گۆڕانکاریە گەورەیەی جیهان و هاتنی ئینتەرنێت و مۆبایل و سەتەلایت بۆ کوردستان ئەمانە سەرەتای گۆڕانی گەورەن لەنێو کۆمەڵگەدا، بۆیە لێرەوە دووبارە پێناسەکردنەوەی چەمکەکانی شەرەف و ئەخلاق و جەستەی ژن و... هتد ئەرکی سەرەکی نوسەرانە کە کاری بۆ بکەن، راستە ئەمڕۆ نەوەیەك هەیە تا رادەیەکی زۆر نەیارە لە دژی نەریتە باوەکانی کۆمەڵگە بە بیری ئازاد تێدەکۆشێ بۆ چەسپاندنی یەکسانی نێوان هەردوو رەگەز، بەڵام نەوەیەکی کۆنەپارێز و کۆنخوازیش هەیە کە وەکو نەوەکانی پێشوو بیردەکەنەوە و هەمان تێڕوانینیان بۆ ژن و شەرەف هەیە و بەردەوامی ئەم نەوەیە لەسەر ئەم عەقڵیەتی کۆنخوازیە زەنگێکی ترسناکە بۆ تاریکترکردنی ئایندەی کۆمەڵگەی کوردی. نەوەی کۆنخواز نەك تەنها هەوڵی دەسبەسەردا گرتنی جەستەی ژن و کچەکانی کۆمەڵگە دەدەن بەڵکو هەوڵی مۆنۆپۆلکردنی بیرکردنەوە و روانین و هەڵسوکەوتی نێو ماڵیشیان دەدەن کە ئەمە ترسناکترین نەوەیە کە هەڵگری عەقڵیەتێکی

سەلەفییە لەدوای راپەڕین نمونـەکانی لەکۆمەڵگـەی ئێمـەدا بەرچاون.

دەستخۆشی بۆ خاتوو مهاباد قەرەداغی و ئەو هەوڵانـەی بۆ یەکسانی هەردوو رەگەز و شیاری کۆمەڵگە دەیدات.



# رامانێك لەمەڕ
# کاریگەریەکانی ئەنفال
# لەسەر ژنی کورد

کاتێك مرۆڤ لە مێژووی کوردستان ورد دەبێتەوە، زۆر بەچاکی بۆی دەردەکەوێت کە نەتەوەی کورد بەدرێژایی مێژوو دووچاری قاتوقڕی و چەوساندنەوە و سڕینەوەی ناسنامەی نەتەوایەتی بۆتەوە و بە زەریایەك خوێن ئەم ڕێگایەی بڕیوە، ڕاگواستنی بەکۆمەڵ و سیاسەتی بەعەرەبکردنی ناوچە کوردنشینەکان و تێکدان و ڕوخاندنی گوند و دێهاتەکان و لە دواقۆناغەکانیشدا کیمیابارانکردنی کوردستان. زنجیرە یەك لە دوا یەکەکانی تاوانی ڕژێمی عێراق بووە کە دەرهەق بەکورد ئەنجامدراوە.

لەم هەموو حاڵەتانەدا مرۆڤی کورد زیان لێکەوتووترین بووە و لەنێو ئەم زیانانەدا ژنی کورد بەدرێژایی مێژووی ئێمە قوربانیدەرترین چینی کۆمەڵگە بووە و هەر لە سەرەتای شۆڕشە یەك لەدوای یەکەکانی کوردەوە ئەو بەچەندین شێوەی جۆراوجۆر قوربانیداوە، هەمیشە لەلایەن ڕژێمە داگیرکەرەکانی کوردستانیشەوە ژن چەوسێنراوەتەوە، یان وەك کارتێك لە جەنگەکاندا کاری پێکراوە، یەکێك لەو جەنگانەی زۆرترین ژنی کوردی تێدا



بووە بەقوربانی کارەساتی ئەنفال بوو، لەم کارەساتەدا ژنی کورد زۆرێکیان بە مەرگ حوکم دران، یان بە وڵاتانی عەرەبی فرۆشران، یان بەبێکەسی ئێستا لە چاوەڕوانی نادیاردا ژیان دەگوزەرێنن، لەم پرۆسەیەدا ئەوانەی لەوێ گەڕاونەتەوە دەگێڕنەوە کە بەبەرچاوی باوك و برا و دایکەوە دەستدرێژی کراوەتە سەر شەرەفی کچان و ژنان کراوە خۆ ئەگەر بەرهەڵستی توند و ڕەتدانەوەی یەکجاری هەبووبێت ئەوە دەستبەجێ کوشتنی ئەو کچ و ژنانە حەڵاڵ بووە.

دەکرێت لەم سەرەتایەوە قسە لەسەر کتێبێك بکەین بەناوی (ئەنفال و ئافرەتی کورد) کەلە نوسینی (عەدالەت عومەر ساڵح)ە، ئەم کتێبە لێکۆڵینەوەیەکە لەسەر کۆمەڵگەی کوردی و ژنی کورد و ئاسەوارەکانی ئەو کارەساتە و بوونی لە ئەمڕۆدا، کتێبەکە لە حەوت بەش پێکهاتووە و نوسەر هەوڵیداوە لەسەرەتادا لە لە چەمکی ئەنفال ورد دەبێتەوە لە قورئانی پیرۆزدا و نوسەر لە بارەی ئەم وشەیەوە لە قورئاندا دەنوسێت؛ ئەنفال لە ڕووی زمانەوانییەوە کۆی (نفل)ە واتای (غنیمە) دەستکەوت دێت، کە لەکاتی شەڕ و تاڵانکردندا بەدەست شەڕکەران کەوتووە، لەڕووی زاراوەیشەوە ماناکەی زیادە

دەستکەوت دەگەیەنێت، ئەویش ئەو ماڵ و سامانەیە کە بە شەڕ لە موشریك و کافران دەسەنرێت، لەم بارەیەشەوە بۆچوونی زانایانی ئیسلام سەبارەت بە واتا و چەمکی ئەنفال ئەوەیە کە ((الأنفـال هو الغنيمه أى كل نيل ناله المسلمون من أموال أهل الحرب))واتە بریتییە لەو ماڵەی کە لە خەڵکی شەڕکەر دەست موسوڵمانان دەکەوێت، کەواتە ئەنفال لە روانگەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە ئەو دەسکەوت و سامان و سەر و ماڵەیە کە موسوڵمانان بە زەبر و هێز لە موشریك و بت پەرستان و بێ باوەڕان سەندوویانە.

بەشی دووەمی ئەم کتێبە تەرخانە بۆ قسەکردن لەسەر کیمیابارانکردنی شاری هەڵەبجە و کاریگەری ئەم پرۆسەیە ئەنجامدانی پرۆسەی دووەمی جینۆساید کە (ئەنفال)ە، ئاشکرایە عێراق لە جەنگی هەشت ساڵەی لەگەڵ ئێراندا بە ئەندازەیەکی زۆر چەکی کیمیایی و بایلۆجی بەکارهێناوە و لە ئەنجامیشدا دەیان هەزار کەس بوونەتە قوربانی و سووتەمەنی ئەو شەڕە، لە ساڵی ١٩٨٧دا و لە گەرمەی شەڕی عێراق- ئێراندا کوردستان دووچاری دژوارترین باروودۆخی سیاسی هات، دوای ئەوەی سوپای ئێرانی لە بەرەکانی جەنگی باشووردا بە تایبەتی لە



(رۆژهەڵاتی بەسرە) و (کەربەلا)دا دووچاری گەورەترین شکستی سەربازی هات و بە دەیان هەزار سەربازی لێ لەناو چوو، هەڵسا بە کردنەوەی بەرەیەکی جەنگ لە کوردستان ئەوەش وای کرد کە عێراق بیر لەوە بکاتەوە کە هەرچی هێز و توانای سەربازی هەیەتی بێنێتە کوردستان بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر هێرشێکی ئێرانی چاوەڕوانکراو، بێگومان ئەو هەل و مەرج و بارودۆخە سەربازییەی کە لە کوردستان گیرساوە و ئەگەری بەرپابوونی شەڕێکی ئاوا دژوار تیایدا وای لە رژێمی عێراق کرد بکەوێتە گیانی هاوڵاتیانی مەدەنی کورد و دەستپێکردنی زنجیرەیەك هێرشی سەربازی بۆ سەریان، کە بێگومان بەکارهێنانی چەکی کیمیایی کوشندەترین و دڕندانەترین کردار بوو، دۆڵەکانی جافایەتی و شارباژێڕ یەکەم شوێنە لە کوردستان کە رژێم بە گوللە تۆپ لە ١٥ی نیسانی ١٩٨٧ کیمیابارانی کرد.

لە دوا مانگەکانی شەڕی نێوان عێراق- ئێراندا و رێك لە ١٩٨٨/٣/١٦ شاری هەڵەبجەی کوردنشین کەوتە بەر دڕندانەترین شاڵاوی بە قڕکردنی کۆمەڵی ئەم سەردەمە، لە چاو نوقانێکدا و لەبەرچاوی هەموو دونیا رژێمی عیراق بە جۆرەها چەکی کیمیایی لە نمونەی (خەردەل،

سیانید، سارین، تابوون، X V) ئەم شارە ئارامەی بۆردوومان کرد و بەتەواوی وێرانی کرد، ئەم کارەساتە بێوێنەیە کوژرانی نزیکەی (٥٠٠٠) پێنج هەزار هاوڵاتی مەدەنی بێدیفاع و نزیکەی (٢٥٠٠٠) بیست و پێنج هەزار بریندار و ئاوارەبوونی دەیان هەزاری تری لێکەوتەوە و ئاسەوارە نێگەتیڤەکانی کە لە دوای خۆی جێیهێشت.بێگومان دیارترین کاریگەریەکانی ئەم جەنگ و کیمیاباران کردنە ژنان قوربانی زۆریان داوە.

بەشی سێیەم تەرخانە بۆ قسەکردن لەسەر ستراتیژی ئەنجامدانی پرۆسەی ئەنفال ئاشکرایە کارکردن بۆ گەشەدان بە ستراتیژێکی پتەو و تۆکمە بۆ بەدیهێنانی هەر ئامانجێك کارێکی ئاسان نییە، ئەم کارە بەقەد ئەوەی پەیوەندی بە ویستەوە هەیە بەقەد ئەوەش پەیوەندی بە هەلومەرجی بابەتییەوە هەیە (دارڕشتنی هەر ستراتیژێکیش پێویست بەوە دەکا بۆچوونێکی تایبەت سەبارەت بە پشت بەستن بە شیکردنەوەی دینامیکییە ئیقلیمییەکان گەڵاڵە بکرێت، ئەمەش پێویست بە توخمە گۆڕاو و نەگۆڕەکانی بۆچوونەکە دەکا بێگومان هەر ئەم توخمانەش کۆڵەگەی ستراتیژی درێژخایەن پێك دێنن).



رژێمی عێراق ستراتیژی جێبەجێکردنی پرۆسەی ئەنفالی تەنها لە روانگەیەکەوە دانەڕشتبوو، بەڵکو بونیادی ستراتیژی ئەنفالی لەسەر تێکەڵەیەك لە فیکری فاشی و نازی و سەهیۆنی و بگرە دڕندانەتر دارڕشتبوو ستراتیژی پرۆسەی ئەنفال لەناوبردنی بە کۆمەڵی نەتەوەی کورد و بڕانەوەی رەچەڵەکی مرۆڤی کورد بوو، هاوکات پرۆسەیەکی دڕندانەی رەقی رژێم بوو بۆ شێواندنی سروشتی کوردستان لەڕووی جوگرافی و دیمۆگرافیشەوە، (بەپێی ستراتیژییەکانی ئەنفال بەعەرەبکردنی شوێن و ناوچەکانی کوردستانیش بوو).

ئەوەی جێگای سەرنج و تێڕوانینە هەموو ئەو تاوانانەی کە رژێم دەرهەق بە گەلی کورد ئەنجامی داون لە ئەنفال و کیمیاباران و راگواستن و کوشتنی بە کۆمەڵ و ئیعدام کردن و بێسەر و شوێنکردنی هاوڵاتیان، دەسەڵاتدارانی رژێمی عێراق راستەوخۆ و بەشێوەیەکی رەسمی دانیان پیاناوە تەنانەت (ئەو بەڵگەنامانەی تیایدا رژێم بەڕەسمی و لەڕێگای رۆژنامەکانی خۆیەوە دانی بە هێرشەکانی ئەنفال ناوە).

بەڵام ئەوەی مایەی پێکەنینە ئەوەیە ئەمڕۆ سەرانی بەعس لە کاتی لێکۆڵینەوەکاندا بۆ دادگایی هەریەکەیان

بێتاوانی و بێئاگایی دەردەخات و تاوانەکان دەخاتە ملی ئەوی تر لە کاتێکدا کە خۆی لەو بەڵگانەی دەستکەوتووە ناوی هەموویانی تێدایە.

بەشی دواتر قسەکردنە لەسەر قۆناغەکانی شاڵاوی ئەنفال. بێگومان ئەوە دەزانین کە حکومەتی بەعس بۆ پیادەکردنی ئەم شاڵاوەش ستراتیژێکی سەیر و دەگمەنی پیادە کرد، ئەویش دەستپێکردنی یەکەم شاڵاوی ئەنفال بوو لە (٢٣)ی شوباتی (١٩٨٨). لەدوای ئەم قۆناغەوە شاڵاوەکان بەردەوام بوون و تا (٢٥)ی ئابی (١٩٨٨). لێرە ئەگەر سەرنج بدەین لە ماوەی ئەم پێنج مانگەدا حەوت شاڵاوی ئەنفالکردن بەدوای یەکدا ئەنجامدراون، ئەمەش بەڕای من دوو هۆی هەیە. هۆی یەکەم بۆ خێرا ئەنجامدانی پرۆسەی ئەنفال، هۆی دووەمیش کپکردنی ئەو چالاکی و جوڵەیەی پێشمەرگە و خەڵکی کوردستان دەستیان پێکردبوو. قۆناغی دووەمی ئەنفال لە بەرواری تەواو بوونی پرۆسەی ئەنفالی یەکەمەوە دەستی پێکرد کە (٢٥ی ئابی ١٩٨٨) و دەڤەری بادینانی گرتەوە گوللە بارانکردنی گیراوەکان لە ئەنفالی بادینان بەشێوەیەکی بەرچاو و ئاشکرا ئەنجامدراوە، ئەوەتا کارەساتترین شێوە لەگوندی کورێمی رووی داوە دوای ئەوەی خەڵکەکە خۆی



داوەتە دەست سوپاوە (٣٣) سی و سێ پیاو و کوڕی هەرزەکار کە تەمەنیان لە نێوان (١٣-٤٣) ساڵیدابووە لەلایەن ئەفسەرێکی سوپاوە کەوا پێدەچێت دوای قسەکردن بە ئامێرە لاسلکی هۆکی تۆکی فەرمانی پێدراوە گوللە بارانیان بکات، بەم جۆرە ئەفسەرەکە لەو جێگایەدا (٢٧) کەسیان لێ گوللە باران دەکات و شەشەکەی تریش دەرباز دەبن، لە گوندی مێرگەتوشدا بەهەمان شێوە دوای ئەوەی خەڵکەکە دەستگیر دەکرێن ژن و پیاو لە یەکتری جودا دەکرێنەوە دواتر ئەو پیاوانەی تەمەنیان لە ژوور پازدە ساڵیدا بووە دەستبەجێ گوللە باران کران.

بەم جۆرە شاڵاوەکانی ئەنفال بە ئەنفالی بادینان لە ٦ی ئەیلولی ١٩٨٨ کۆتایی پێهات، ئەم ئۆپەراسیۆنە فاتوقڕییە کوردستانی وێران کرد و ژێرخانی ئابووریشی لە بنەچەوە هەڵتەکاند، ئەنفال تاوانێك بوو کە دنیا بێدەنگی لێکرد، بەڵام بۆ مێژوو و رووداوێکی وابوو مەحاڵە لەیاد بکرێت.

بەشەکانی دواتری ئەم کتێبە تەرخانە بۆ قسەکردن لەسەر ئەنفالکردنی ژنانی کورد و کاریگەرییە کۆمەڵایەتییەکانی. نوسەر سەرەتا پشت بە پێناسەکردنی رەوشی کۆمەڵایەتی ئافرەتی کورد دەبەستێ و دواتر باس لە پرۆسەی ئەنفالکردنی ژنانی کورد دەکات، دیارە

ئافرەتیش وەکو توێژێکی سەرەکی کۆمەڵ و رەگەزێکی کاریگەر تیایدا بەشی هەرە زۆری ئەو زەرەر و زیانانەی بەرکەوت و بووە قۆچی قوربانی ئەو ئۆپەراسیۆنە بەدناوە، ئاسەوارە نێگەتیڤەکانی ئەنفال لەسەر ئافرەت تاوەکو ئەمرۆ بەردەوامە و بەڵکو رۆژ دوای رۆژ لە زیادبووندایە بەتایبەتی ئەو ئافرەتانەی کە پیاوەکانیان تاوەکو ئێستا بێسەر و شوێنن و رووبەرووی کۆمەڵێك گیروگرفتی خێزانی بوونەتەوە و چارەنوسیان نادیارە.

رێکخراوی (MEW) (چاودێری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست) لە ساڵی ١٩٩٢ لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ ئافرەتێکی گوندی شێخ حەمیدی قەزای دوز خورماتوو گەیشتۆتە ئەو رایەی (کە پاش گرتنی خەڵکەکە ژن و پیاو لە یەکتر جیا کراونەتەوە ئینجا پیاوەکان بۆ شوێنی نادیار گواستراونەتەوە، دواتریش بەهەمان شێوە ژن و منداڵەکانیان).

سوکایەتی کردن بە ڕەوشت و کەرامەتی ئافرەتان و ئازاردانیان دوور لە هەموو دابونەریتێکی مرۆڤایەتی یەکێك بووە لە ئامانجە هەرە سەرەکییەکانی رژێمی عێراق لە ئۆپەراسیۆنی ئەنفالدا، (وەکاتێك پیاو و ئافرەتەکان لە یەکتری جیاکراونەتەوە، جەللادەکان



دەستدرێژییان کردووەتە سەر ناموسی ئافرەتەکان و تەعدایان لێکردوون).

ئافرەتێکی هەڵهاتووی عەرعەر دەڵێت: (رۆژی وا هەبووە دوانزە پیاو هاتوونەتە لام و دەستدرێژیان کردووەتە سەر ناموسم) رێکخراوی (MEW) لەو بڕوایەدایە کە (دەنگ و باسێکی زۆر ترسناك هەیە کەوا لەبارەی کۆمەڵێکی گەورە کچی عازەبەوە دەدوێ گوایە بەجیا لە بەندییەکانی تر دایانناون و بەردەوام ئەمنەکان دەستدرێژان کردوونەتە سەر، هەروەها باسی ئەمەش هەیە کە یەکێك لە ئافرەتەکان لە ئەنجامی ئەم کارەدا خۆی بە چەقۆیەك کوشتووە).

زۆر بەڵگە هەن کەوا ئەفسەرەکانیسوپای عێراقی هەستاون بە فرۆشتنی ئافرەتی کورد تەنانەت بۆ وڵاتانی دەرەوەش بەتایبەتی وڵاتانی کەنداو، (کەنعان مەکیە) دەڵێت: (بەرلەوەی بڕۆمە باکوری عێراق گوێبیستی گەلێك چیرۆکی سەیر و سەمەرە و نامۆ دەبووم وەك ئەوەی ئافرەتە کوردەکان چۆن لە بازاڕە پەرت و بڵاوەکانی کەنداو فرۆشران).

پرۆسەی بەدی ئەنفال وێڕای قات و قڕکردنی گەلی کورد و وێران کردنی کوردستان و تێکدانی ژێرخانی

ئابووری، گەلێك دەردەسەری و نەخۆشی کۆمەڵایەتی لەدوای خۆی بەجێهێشت کە تاکو ئێستاش پاشماوەی کەس و کاری ئەنفالەکان بەدەستیانەوە دەناڵێنن، راستە ئەم پرۆسەیە گشت چین و توێژەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری بەبێ جیاوازی گرتەوە، بەڵام هەروەك لەمەو پێش ئاماژەمان پێکرد ئافرەتی کورد بەشی هەرە زۆری لەو دەردەسەریانە بەرکەوت بەتایبەتی دوای ئەوەی رەوانەی ئۆردووگا زۆرەملێکان کران ئەویش بۆ مردنی لەسەرخۆ و تێکدانی رەوشی کۆمەڵایەتی و شکاندنی کەسایەتییان بەهەموو جۆرێك.

زێدەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێین نەخۆشییە دەروونییەکانی ئافرەتانی کەس و کاری ئەنفالکراوەکان بەرێژەی نەخۆشییە جەستەیی و لەشییەکان یەکسانن و رۆژ لەدوای رۆژیش لەزیادبووندایە ئەگەرچی تاکو ئێستا بەپێی زانیاری نوسەر لێتوێژینەوەیەکی دروست و ئامارێکی سەرتاسەری لەمەڕ ئەو نەخۆشییانە ئەنجام نەدراوە.

بەڵام ئەگەر سەرنجێکی ورد بدەینە روخساری کەس و کاری ئەنفالکراوەکان و لەبارووdۆخی تەندروستی و کۆمەڵایەتییان بکۆڵینەوە ئەوا بە ئاشکرا ئاسەواری ئەو



نەخۆشییانە بەدیار دەکەوێت. لە لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانییدا توێژەرێك لە کۆی (١٥٠) خێزان کە زۆربەیان ئافرەتن ئەنجامی داوە (٤٧)خێزان دووچاری نەخۆشی دەروونی وەك دڵەراوکێ و خەمۆکی و ترس و لەهۆش خۆچوون و هتد هاتوون.

سەرەڕای هەموو ئەمانەش دەیان گیر و گرفتی کۆمەڵایەتی بۆ پاشماوەی خێزانە ئەنفالکراوەکان دروستکردووە. وەکو نەخوێندەواری و داڕمانی باری ئابووری و خێزان... هتد کە ئەمانەش کاریگەری زۆر خراپی لەسەر بونیادی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەی کوردی هەیە. بێگومان (توێژی ئافرەت) لە پێشینەی هەمووان دێت، چونکە دوای ئەنجامدانی ئەم تاوانە هەموو ئەرکەکانی کۆمەڵگا هەر لە پەروەردەکردنی منداڵ و ئیش و کاری ناوماڵ و کارکردنی لە دەرەوە بۆ پەیداکردنی بژێوی رۆژانە کەوتە سەر شانی ئافرەت بەوەی کە رێژەی پیاوەکان زیاتر بەر شاڵاوەکە کەوتوون بەرامبەر رێژەی ئافرەتان، بێگومان ئەوەش ئامانج و مەبەستی سەرەکی رژێم بووە بۆئەوەی خێزانی کورد پەرتەوازە بکات و ئافرەتەکانیش دیاردەی نامۆیی و دوور لە داب و نەریتی کۆمەڵایەتی بکات.